مەسعوود محەمەد

# زمانی کورد

حەکیم کاکەوەیس

لە عارەبییەوە کردوویەتی بە کوردی

چاپی یەکەم بە زمانی عارەبی

لسان الکرد

مسعود محمد

لە سەر ئەرکی کاک ئەحمەد وەلی هیممەت چاپ کراوە

چاپخانەی حەوادس

ژمارەی مۆڵەت 11 ڕۆژی مۆڵەت 3 ـ 1 ـ 1987

ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی نیشتمانی بەغدا 74 ساڵی 1987

«زمانی کورد»

تەرجەمەی «لسان الکرد»

دیزاینی بەرگ: محەمەد عوسمان

وەشانی سایتی www.mamosta.net ساڵی 2010

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( 25 ) ی ساڵی 2014 دراوەتێ**

نرخ : ( *3000* ) دینار

پێشەکی وەرگێڕ

وەرگێڕانـــی بەرهەمە عارەبیەکـانی مامۆســتا مەســعوود مــحەمەد بــۆ کەسێکی کە لە زمانزانی و شارەزاییدا لە ئاستی خۆیەوە نێزیک نەبێ، گەمەکردنە بە ئاگر و مـن ئەو گەمەیەم کـرد. تـرس دایگـرتم کەتـنم کردبێ، بەڵام ئەمڕۆ خوێندنەوەی کتێب بە هۆێ خوێندنەوەی هەواڵە وەرزشیەکان و خەبەری ژیانی تـایبەتی یاریزانـانی دنیا و ئەستێرەکانی هۆلیـوود و کەلـووی بەخـت و حەجـی گـوڕی ئومکەلسـووم و بـابەتی سـەرگەرمکردنی تـرەوە، خەریـکە لە نـاو کورددا باوی نەمێنێ و ترسـی منـیش دەبێــتە ترســی دواڕۆژ! کــێ دەپەرژێــتە ســەر دەق و بـابەتی وەرگێڕدراو و وەرگەڕێندراو و بەراوردکاری و هەڵسەنگاندن؟! من یاریم بە ئاگر کردووە چونکە هەر دەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان، یەکێ ئەو یارییە بکا و ئامادەشم بۆ ئەوەی دەست بە سینگەوە بگـرم بـۆ هەر هەڵەیەکی کە دەرهەق بە مامۆســتا مەســعوود مــحەمەد و بەرهەمە عارەبییەکــانی ئەنجامم دابێ. خۆ ڕەنگیشە ئەم کارەی مـن ببێتە بناغیەک بۆ کارێکی لەخۆی باشتر و تەواوتر و ڕەوانتر... ئەوەش خراپ نییە.

نەمــدەزانی بەرهەمە عارەبیەکـانی ئەو مامۆســتا نەمــرە بــۆ ئەوە دەبــن وەربگێڕدرێنە سەر زمانی کورد، بەڵام کە هەندێ لەو گوتارە کورتـانەی مامۆستام کردنە کوردی کە لە «العراق»دا بڵاو کرابوونەوە، هەستم بە بوونی خواوەنـدی وەرگێـڕان کـرد بە تەنیشتمەوە... هەستم دەکرد پێم دەڵێ لە جێی ئەو ڕستە قورسە عارەبییانە چ بنووسـم. ئاخر هەرگیـز، لە هیچ کتێبێکی عارەبیدا نەمدیوە «ربط طارفها بتليـدها» بەکار هێنـدرابێ و هەر بە زەبری قاموس زانیم بەستنەوەی کۆن و نـوێیە بە یەکەوە و هەتا زانیم گیانم دەرچوو... تۆ بڵێی زانیبێتم؟! یا «هذا حصرم رايته فی حلب» کە بە شێوەیەکی ئاسایی دەکرێتە «ئەمە پەرسیلە ـ بەرسیلەیە ـ

و له حەلەب دیومە» یا بە پێی یاسای وەرگێڕان دەبێتە: «ڕێوی دەمی بە پەرسیلە نەدەگەیشت دەیگوت ترشە» یا «ئەم نانە بەو ڕۆنە»؟ بە ڕای من دووەمیان ڕاستە یا لە ناوەڕۆکی باسەکەوە نێزیکترە. کابرای شایەر کە هێندەی لە باردا نییە و بۆی هەڵناکەوێ بگاتە دەربار، هەر دەبێ بڵێ: من لەوە گەورەترم لە دەرباردا بکەووم و لای مامۆستاش، باس باسی شایەرە نەک زانا و خەڵکی خاوەن هەڵوێستی وەک حەیدەری و مەلا ئەفەندی، کە خۆی لەم نووسینەدا باسی هەڵوێستی کردوون. تەیموور لەنگیش لەم بارەیەوە، بە زیادەڕۆییەوە دەڵێ: گومانی تێدا نییە سەدان زانا و دانا و فەرماندە، گوێڕایەڵی جەنگاوەرێکی وەک منن.

مامۆستا، هەوڵێکی زۆری داوە بە ڕەگ و ڕیشەی وشەدا بچێتە خوارێ و خزمایەتی نێوان وشەی کوردی و ئاڤێستایی لە لایەکەوە و کوردی و زمانە هند و ئەورووپییەکان لە لایەکی ترەوە بدۆزێتەوە و ڕەگیان بگەڕێنێتەوە سەر یەک. ئەم کارەی مامۆستا، منیشی خستە سەر کەڵکەڵەی دۆزینەوەی ئەو خزمایەتی و هاوڕەگییە و ئەمەش نموونەیەکە کە بیرم کەوتەوە: لە سەرەتای فێربوونی زمانی سویدیدا بووم، مامۆستاکەمان وشەی «ئەستێرە»ی لە سەر تەختەکە، بە زمانی سویدی نووسی و گوتی: هەر یەکەتان بە زمانی خۆی ئەو وشەیە بنووسێ. ئێمەی بێگانە لە سوید، کە هەر یەکەمان سەر بە وڵاتێک و زمانێک بوو، وشەکەمان نووسی. من نووسیم: Estere. مامۆستاکەش دەستی دایە ماجیک و خەتی بە بن هەندێکیاندا هێنا و گوتی: ئەمانە سەر بە هندوئەورووپییەکانن، چونکە هەموویان s و t و r یان تێدان.

دوایی بینیم وشەی هاوبەشی تریش لە نێوان هزمانە ئەورووپاییەکان و کوردیدا هەن کە هەزاران کیلۆمەتر لە یەکەوە دوورن و خواش دەزانێ

کەی لە کۆڕەوی گەلە سەرەتاییەکاندا، لە ناوەڕاسی ئاسیا، هندوئەوروپی و هندوئێرانی لێکدابڕاوون:

گۆل لە سویدیدا Göl ە و وەک گوێل دەگوترێ، گورگ لە زازاکیدا verg و بە سویدی varg، ڕێژنە «باران» لە سویدیدا regn، دوێت بە سویدی dotter، ئافرەت، «ئافرۆدیتا»یە «خواوەندی زاوزێ لای یۆنانی»، شوور کوردییە و tjur سویدیە و هەر بە شوور دەخوێندرێتەوە، جگە لە هەندێ لە ژمارەکان و زۆر وشەی دی. داستانە یۆنانییەکانیش، ئەگەر بە وردیی بیریان لێ بکەینەوە، دەبینین هەندێ خزمایەتییان لەگەڵ ئەو داستانانەدا هەیە کە لە ئایینی میترایی و زەردەشتیدا هەبووە.

ئەم لستەیەش نێزیکایەتی زمانی ئاڤێستا و کوردی دەردەخا و بۆچوونەکەی مامۆستا دەسەلمێنێ:

| وشە ئاڤێستاییەکان | بە کوردی ئەمڕۆ |
| --- | --- |
| دوا | دوو |
| چەتوار | چوار |
| پانجا | پێنج «پەنج» |
| خشواش | شەش |
| ئاپتا | حەوت |
| ئاشتا | هەشت |
| ناوا | نۆ |
| دانا | دە |
| ئوروانەم | گیانم «ڕەوانم» ڕەنگە «قوربان» خزمی |
| بێ | |
| دەد | دەدەم |
| تەڤا | توانا |
| ئەوەت | گەرەکمە «ئاواتم» |
| کەت | کەنگێ «کەی» |
| ماڤ | مانگ «هەیڤ» |

و... زۆری تر کە بە شێوەیەک لە شێوەکان دەچنەوە سەر یەک.

وەک ئەوەی ناوی «گاوانی کوردی» و «سەلمانی فارسی» لە قورئاندا هاتبێ، ناوی «فریانە»ی تووڕانی لە ئاڤێستادا هاتووە کە یەکێ بووە لە تووڕانییەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەو دەمەی ئێران و تورکەکانی ئەمڕۆ ڕەگی خۆیان دەگەڕێننەوە سەریان. دواتر هەر تووڕانیەکان، کە وەک دێوپەرست ناویان لە ئاڤێستادا هاتووە، زەردەشتیان کوشت. لەوساوە کورد دڵی بە فریانە خۆشە و هەوڵ دەدا برایانە لەگەڵ تورکدا بژێ و ئەم تەمایە لە ئاڤێستاشدا هەیە. خۆشبەختانە دوای 26 سەدە «سمایل بێشکچی»ی تاک و تەنها و تەریکمان بە لای خۆماندا ڕاکێشا و بووە برامان! دەبێ 26 سەدەی تر چاوڕوان بین تا یەکێکی تریش لە تووڕانیەکان ببێتە برامان... کەروێشک بە عارەبانە دەگرین!

بە پێویستی دەزانم ئەم دەقە ئاڤێستاییە بگوازمەوە: «**کاتێ خزم و کەسی فریانەی تووڕانی هاتنە سەر ڕێگا و ئایینی ڕاستی و بە ئەشق و ئیمانەوە بۆ گەشە و پێشکەوتنی جیهان هەوڵ بدەن لە سایەی ئەندێشەی چاکدا دەبنە یەک و سەرەنجام ئەهورامەزدا ئارامش و ئاسایشتیان پێ دەبەخشێ**»[1] ئێستاش هەمان ئایەت یا بە شێوەیەکی تیۆریزەکراوی سەردەمانەی وەک ئەو ئایەتە بێ هوودە لە هەڵپەی ئەوەداین لەگەڵیاندا برا بین... لەو داهێنانە مەزنەوە، بە هەمان شێوە برایەتی لەگەڵ میللەتانی تریشدا دەکەین و ئەنجامیش، هەر 26 سەدە برایەک بە دەست دێنین یا نایەنین! ئای ئێستامان چەند بە ڕابردوومان دەچێ و پێ دەچێ داهاتووشمان هەر بە ئێستامان بچێ!

---

[1] ـ بڕوانە: ئاڤێستا ـ گاتا ـ کان لە مێژینەترین سروودی کوردی. جەلیل عەباسی. دەزگای ئاراس 2003

لە کۆتاییدا، دەمەوێ سوپاسی کاک «ئەمجەد شاکەلی»ی برام بکەم کە بە کوردییەکەی ئەم وەرگێڕانەدا چووەوە و زۆری لە هەڵە و خواروخێچی دەستنیشان کرد و منیش بە خۆشحاڵییەوە ڕەچاوی زۆربەی زۆری سەرنجەکانیم کرد.

حەکیم کاکەوەیس
5/2/2008
kakaways@hotmail.com

بەینێکە شەپۆلێکی خاوی گومان بە ناو نووسەرانی کورددا دەگەڕێ و هۆیەکەشی ئەو بۆچوونەیە گوایە بەکارهێنانی وشەی کوردیی هاوشێوە و هاوتەرحی وشەی فارسی لە نووسینی کوردیی سەردەمدا، بۆی هەیە خزمەتی ئەدەبی فارسی بکا. چ ڕێمان نییە ئەوە نەبێ ئەو بابەتە بۆچوونە بە نیازپاکی خاوەنەکەی لێکبدەینەوە، ئەوەش بە هۆی ئەو کەشوهەوا خاوێنەوە کە ڕۆشنبیریی کوردی هەناسەی تێدا هەڵدەمژێ، ئەمەشیان بە هۆی نەبوونی خڵتوخاشەوە بێ یا بارودۆخ وا بخوازێ ئەوانەی لە بواری ڕۆشنبیریی کوردیدا کار دەکەن، لە هەموو ڕووشاندنێک بیپارێزن کە ڕێی تێ بچێ بیرووشێنێ و حەزمان پێی نەبێ. وای بۆ دەچم ئەوە بووبێتە هۆی سڵکردنەوە و دەسبەکاربوون تا بۆ وشەی ڕەسەنی کوردی لە پارێزدا بن و لە نووسیندا بیانسڕنەوە نەوەک لۆمە بکرێن.

وام هەست کرد ئەرکی من دەگاتە ئاستی واجبی نەتەوەیی و نیشتمانی بۆ ئەوەی چرا کزەکەی خۆم پێ بکەم و تیشکێک، ئەوەندەی هەیە، بخەمە سەر هۆکاری ئەو گومانانە، ئەوەش بە پێی ئاگاداریم لە سەرچاوەی کوردی و فارسی و زمانە ئارياييەكانی تر، لە سەنسکریتەوە بگرە تا دەگاتە پەهلەوی و هی دی، کە گاریگەرییان لە سەر بنیاتنانی کەلەپووری بەشە ڕۆژهەڵاتییەکەی هند و ئەورووپی کەمترە، لەو دەمەوە کە بەشە ڕۆژاواییەکە لێی دابڕاوە و تا ئێستا کەس نازانێ چ سەردەمێ بووە. ئاخر زانیاری لە سەر سەرچاوەی چەند جۆگە ئاوێکی نێزیکی یەک، هەق وایە گومانی تێکەڵاوبوونیان بڕەوێنێتەوە. هیوای ئەوە بە زانا و زمانزان و ئەدیبە بەرزە عارەبەکان دەکرێ بایی ئەوە ئاوڕ لەو بابەتە

بدەنەوە کە جێی گرنگی پێدانیانە و ڕەنگە سەرقاڵییان بە مەسەلەی عارەبایەتییەوە، لە ڕووی سیاسی و ڕۆشنبیری و شارستانییەوە، ڕیگر بێ لە بەردەم ئەوەی بە بابەتێکەوە خەریک بن، کە لە چەقی سەرقاڵییاندا نییە و لە هەمان کاتدا چەند زمانێکی کۆن و سەردەم، پێویستییان بە وردبوونەوە هەیە و ژمارەیەکی یەکجار کەم نەبێ بۆیان نەلواوە لە ڕابردوو و لایەنەکانی ورد ببنەوە. لەوانەیە ئەم هەوڵە بچکۆلەیەم بۆ لابردنی تەمومژی سەر سیمای مەسەلەکە، ماندویتی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیان لە کۆڵ بکاتەوە و هەندێ حەقیقەتی شاراوەی وا لە بارەی بابەتەکەوە بە دەست بێنن، بۆی هەبێ بیانگەیەنێتە کەناری ڕەواندنەوەی تەمومژ. گومانی ناوێ کە خوێنەرانی کورد بە شێوەیەکی گشتی تا ئەم سەعاتە ئەو چرایانەیان کەمن کە زمان و مێژوو و سەرجەمی لایەنە کۆمەڵایەتییەکانیان ڕووناک بکاتەوە، چونکە دەستیان لە لێکۆڵەرەوە و توێژەرەوەی کوردی وا گیر نابێ خۆی بۆ ڕەواندنەوەی تاریکییەکان تەرخان کردبێ و نە توانا و نە پارە و نە مەودا و نە پشتگیری، هیچیان، بە هیچ جۆرێ شتێکیان لەوانە نەبوو بیخاتە سەر ئەو ڕێیەی کە بەربەستی وەک مەحاڵی لە پێش بووە. توانای منیش لە توانای ئەوان باشتر نەدەبوو ئەگەر بارودۆخ وای نەکردبا چاووم لە کۆیە هەڵبێنم و ببینم و بەراوردی کۆمەڵێ شتی وا بکەم کە هۆشی مرۆڤیان سەرقاڵ کردووە و لە چەند ساڵێکی حەفتاکاندا سەرچاوە و کتێبی وام دەستکەوتن کە لە سەر ئاریایی و ئێرانی پەرەیان بەهۆشم دا و ئەوانەش، زۆربەیان فەوتان و دڵی خۆم بەو کەمە خۆش دەکەم کە ماونەتەوە و ئیشتیا دەکەنەوە و تێریش ناکەن. ڕەنگە خەڵکی تر لە مەیداندا هەبووبن و پەنامەکی هەوڵیان دابێ و گوێمان لە دەنگیان نەبووبێ و لە کاتی سووڕانی بەرداشیان بێ خەبەر بین ئاخۆ کەی ئاردی

ڕۆشنبیری و زمانەوانی و مێژوویی کورد بەرهەم دێنێ تا هەویر بۆ عەقڵ بشێلێ.

نووسەرانی عارەب مافی ئەوەیان بە سەرمەوە هەیە لەم جێیەی خۆمەوە دانی پێدا بنێم کە بە هۆی هەوڵی درەنگوەختی ئەوانەوە لە بەرفرەوانکردنی زمانی عارەبیدا لە دوورگەی عارەبییەوە، هەر زمانێکی مردوو و بێ لایەن و دوژمنی سەر بە زمانە سامییەکان لە دوورگەی عارەبییەوە هاتبێ ئازایانە خستوویاننەتە ناو عارەبییەوە، ئەوەش بۆ من هاندانێکە بۆ هەڵکۆڵینی ڕابردوو و بەدەستهێنانی بەڵگە بۆ سەربەخۆیی زمانی کوردی بە ڕەگ و ڕیشاڵیەوە. چاوەڕوانیش بووم تا بەڵگەی ئەوەم بە دەست کەوت کە خاوەنداریتی شەرعی زۆر لەو وشە هاوبەشانەی کە لە نێوان خۆی و زمانەکانی تردا هەن، کوردین و تەنانەت ئەوەشم بە دڵنیاییەوە بۆ ئاشکرا بوو کە بە هۆی بێ خاوەنی و بێ توانایی و ماڵوێرانییەوە، لە ماوەی بیستوشەش سەدەدا، زۆر لە وشەکانی تووشی تاڵانوبڕۆی زۆریش بوون. ئەگەر عارەبی بە هۆی توانا و پتەویی بوونیەوە بەوە شێلوو نابێ کە وشەی هاوشێوە لە نێوان زمانی هەندێ عارەبی داگیرکراوی گۆی زەوی و داگیرکەردا هەیە و سڵ لە بەکارهێنانی «رستاق و لوزینج و زیئبەق و بەیدەق و بەرنامەج و ساذج و خەندەق...» ناکەنەوە و جەنگیش ئاگری سەر سنووری ڕۆژهەڵاتە، لەمەدا بە بەراوردکاری بە ئەنجامی ڕاستیی بوونی وشەی هاوبەش و تالانکراو گەیشتم کە لە بنەڕتدا کوردییە و خزمایەتییەک هەیە کە لەوە توندوتۆڵترە تەنها بە هێز ڕەت بکرێتەوە، چونکە هەرگیز دایکێکی بە دایکایەتی پشتئەستوور و بە بەڵگەنامەی شووکردنەوە، تاوانبار ناکرێ ئەگەر لە بەر برسێتی و هەژاریی لە سەرەمەرگیشدا بێ.

ئەو سەرچاوانەی لە بواری ئەم باسەدا لە بەر دەستدان، وردەکاری و لێکۆڵینەوەی زمانەوانی و مێژوویی و شوێنەوارزانی کۆمەڵێ زانای ڕۆژاوایی سەردەمی جیاواز و شوێنی جیاوازن و شوێنەواریان لە کتێبی دەستەیەک لەو ئێرانیانەی کە گرنگی بە کەلەپوور و فەرهەنگی ئێرانی بە شێوەیەکی گشتی و فارسی بە تایبەتی دەدەن، هەیە بەڵام بوونی کتێبێک کە بە کەڵک بێ و بە زمانە ڕەسەنەکەی خۆی نووسرابێ، لە عیراقدا دەگمەن بووە و بۆ کوردیش هێنانی کتێب لەو وڵاتەوە کە تێیدا نووسراوە، لە بەر ئەو هۆیانەی کە پێشتر باسم کردن، زەحمەت بووە و لە مەودای نێوان ساڵی 1971 و 1978دا، لەو کاتەدا کە لەگەڵ برایانی تری دامەزرێنەری کۆڕی زانیاری کورد بووم لە بەغدا و بە هۆی پەیوەندی توندوتۆڵی کۆڕە زانیارییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەمەریکا و ئەوروپاوە، بە یەکێتی سۆڤیەتیشەوە، هەندێ لەو سەرچاوانە پێشکەشی من کران و کاتێ لە ناوەڕاستی ساڵی 1978دا لە کۆڕ دابڕام، زۆربەیانم بۆ کۆڕ بەجێ هێشت و ژمارەیەکی زۆر کەمیان لای من مانەوە، لەوانە «فرهنگ ایران باستان»ی خوالێخۆشبوو پوور داود و کتێبی «مزدیسنا وادب پارسی»ی دکتۆر محەمەد موعین و کتێبی «کارنامەء اردشیر بابکان»ی دکتۆر بەهرام فرەوەرشی و هەندێ سەرچاوەی ترم خواستنەوە، لەوانە هەر سێ بەرگی «تاریخ زبان فارسی»ی دکتۆر پەرویز نائیل خانلەری و چەند ژمارەیەک کە لە سەر بڵاوکراوە دەژمێردران و ناویان «بەربانگ» بوو و لە ستۆکهۆڵم دەردەچوون و Tiraj بە تەنیشتیەوە نوسرابوو و Izmir ، هەردووکیان بە شێوەزاری زازایی کوردی بوون. ئەو کتێبە ناوبراوانە، جگە لە کارنامەی ئەردەشیر، پشتیان بە ژمارەیەکی زۆری سەرچاوەی هەمەجۆری کاتی جیاوازی سەردەمە نوێیەکانی ئەوروپا و ئەمەریکا بەستووە کە بە

کـردنەوەی واژەو نەخشــی کـۆنەوە خەریـک بوونــە و ئەوروپاییەکـانی تریان خەریکی کردنەوە و لێکدانەوەی واژەی هیرۆگلیفی و سۆمەری و دوای ئەوان، ئەکەدی و ئاشوری و بابلی و هەموو زمانە کۆنەکانی وەک سامی و ئـاری و هـی تـر بـوونە. بەڵام نووسـەرە فارسـەکان لە بـواری شوێنەوارە کۆنەکاندا، زۆریان خستۆتە سەر کاری ڕۆژاواییەکان و هەموو سـەرچاوە مێژووییەکـانی ئیسلام، کە پشـت بە باسـکردن و گێـڕانەوەی دەماودەمی سەردەمی خۆیان دەبەستن. گەلێ جـار قسـەی ئەو لێکـۆڵەرە ئێرانیانە دەخوێنمەوە و بۆچوونەکەم بەوە پشتئەستوور دەبێ «شایەدێک لە خۆیـان شـایەدیی دا» یـا دانپێـدانانی نەیـار، ئەوەش کۆشـش و کـات پاشەکەوت دەکا. یەکێ لەوانە خاوەنی «تـاریخ زبـان فارسـی» لە لاپەڕە 38ی بەشی دووەمدا و لە سەر زمانی «لوڕی و بەختیاری و خێڵەکانی مەحسنی و بویر ئەحمەدی ڕۆژاوای ستانی فارس» دەیڵێ کە خزمایەتی لەگەڵ زمـانی کوردیـدا هەیە و بەشـی ئەوە دەکـا قسـەی هەنـدێ لە ئەوروپاییەکان بکاتەوە و حاشا بکا کە پەیوەندی لە نێوان کـوردی و ئەو شـێوەزارانەدا هەبێ. هـی تـر لەو لێکـۆڵەرەوانە دەبیـنم هەمـان قسـە لە بارەی زمانی کوردییەوە دەڵێنەوە و جارێ بە زمان ناوی دەبەن و جارێ بە شــێوەزار و دیســان دەیــکەنەوە بە زمــان و زۆر ســەیرە زمانێــک خەڵکانێک لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا قسەی پـێ بـکەن کە ژمارەیـان لە فارســەکانی ئەو جێــیە زۆرتــرە کە پێــی دەڵــێن وڵاتــی فــارس و بە شێوەزاریش ناوی بەرن!

ئەو کتێبـانەی کە نـاووم هێنـان و پێشـینەی ئەوروپاییـان هەیە، دەبـنە سەرچاوەی ئەم باسە و دەشێ بۆیان بگەڕێینەوە. چ بە پێویستی نازانم لە هەمـوو بۆچوونێکـدا کە دەمەتەقێـی لە سـەر دەکەم یـا پشـتی پـێ دەبەستم ئاماژە بە سەرچاوەکە بکەم ئەوەش بۆ خۆلادان لە درێژدادڕی.

تەنها لە جێیە پێویستەکاندا یا لەو جێیانەدا کە پێویست بە بەڵگە بکەن، ئاماژە بە سەرچاوەکە و لاپەڕەکە دەکەم. پێم باشە بۆ دڵنیایی ناوی هەندێ لەو سەرچاوانە تۆمار بکەم کە خاوەنی ئەو کتێبانە پشتیان پێ بەستوون.

لە یەکەم کتێب «فرهنگ ایران باستان»ی پوور داود ناوی 26 سەرچاوەی عارەبی و فارسی تۆمار کراوە، کە یارمەتیدەری دانانی کتێبەکە بوونە و بە باسکردنی «الاثار الارامية في لغة الموصل العامية ـ شوێنەواری ئارامی لە زمانی ناوچەیی موسڵدا» ـ داود الجلبی 1354ە» دەستی پێ کردووە. سەرچاوەکانی تری بیرونی و هەواڵە دوورودرێژەکانی بیرونی، ئەوجا ناوی کتێب بە پێی حەرفی هیجا و لە پیتی «ب» دا «بیست مقاله»ی محەمەد قەزوینی، نەسکی2 تاران 1313ی شەمسی و لە «ت» دا تاریخی نرشحی ـ مێژووی نەرشەحی لە بارەی بوخاراوە کە لە تاران چاپ کراوە و لە «ج» دا «جغرافیای تاریخ ایران ـ بارتۆلد وەرگێڕانی سەردادوەر، تاران 1308» و لە «ح» دا «حدود العالم....» ئیدی ئاوها تا کۆتایی لستەکە کە بە وەفاتی ئەعیانی ئیبن خەلەکان، چاپی تاران کۆتایی دێ. لە هەر پیتێکدا نموونەیەکم هێناوەتەوە جگە لە هەمزە (3 نموونە)

دوای ئەوە دێتە سەر ناوی ئەو کتێبانەی کە تایبەتن بە لێکۆڵینەوە لە سەر ئاڤێستا و ئەوانەش پێنجن. ئەوجا خوێنەر دەباتە سەر بە دواداچوونی ئاڤێستا لە کتێبی نووسەراندا: بارتولومە Bartholomae و دارمستەرDarmsteter و دە هارلە De Harlez و ڕێخلت Reichelt و هی دی.

ئەوجا دێتە سەر باسی ئەو کتێبانەی کە بە پەهلەوی نووسراون و پەیوەندییان بە کتێبی وەک ئەرداوێرافنامە، ئەردەشیر بابکان و بندهش و بیست کتێبی ترەوە هەیە.

ە تۆمارکردنی تایبەت بە بەرهەمە ڕۆژاواییەکاندا یەکەم ناو ژمارە 52ە و لە ژماردندا بەردەوام دەبێ تا دەگاتە ژمارە 203 و ئەوەش هەموو ئەو سەرچاوانەیە کە بۆ نووسینی کتێبەکەی پێیاندا چۆتەوە. کۆنترین کتێبی ڕۆژاوا کە لەگەڵ پێنجی تردا ناوی هاتووە، مێژووەکەی بۆ 1852 ـ 1854 دەگەڕێتەوە و هی ویستەر گاردە. کۆنترین کتێبی تۆمارکراوی کۆتایی ژمارە 52ە و ساڵی 1853 ـ 1854 ە و هی کارل بوشێلە.

هەروەها، هەردوو کتێبی «مزدیسنا و ادبی پارسی» و «تاریخ زبان فارسی» پڕن لە سەرچاوەی هەمەجۆر و هەمەڕەنگ و هەمەسەردەم و ئەگەر خوێنەر بیەوێ، دەتوانێ بگەڕێتەوە سەریان.

لە مێژوودا وا باوە کە دەستەیەکی گەورەی ڕەگەزی سپی بەشەر لە چەند شوێنێکی سەرزەمینی باکووری دەریای خەزەر نیشتەجێ بوونە و مێژوونووسەکان لە سەر جێی ڕاستییان هاوڕا نین. پێش ئەوەی مەسیح لە دایک بێ بە پتر لە هەزار ساڵ، بوونەتە دوو بەشەوە و یەکێکیان بەرەو ڕۆژاوا چووە و لە ئەوروپا بڵاوەیان لێ کردووە. بەشەکەی تریان بەرەو ڕۆژهەڵات چووە و ئەمانیش بوونەتە دوو بەشەوە، یەکێکیان لە هند گیرساوەتەوە و ئەوی تریان لەو جێیەی کە ئێستا پێی دەڵێن ئێران، نیشتەجێ بووە. مێژوونووسان ئەوانەیان لە دابەشبوونی یەکەمدا ناو نا هند و ئەوروپی و هی دووەمیشیان ناونا هند و ئێرانی. ماوەیەکی دوور و درێژ بە هەموان دەگوترا ئاری بەڵام دواتر هەڵەی ئەم ناولێنانە دەرکەوت و تەنها بۆ هند و ئێرانییەکان «ئاری arya» بە کار هێندرا. ئەو هندییانەی باکووری هند کە بە سانسکریتی داخاوتن، لە ڕووی زمان و ڕەگەزەوە ئارین و لەگەڵ درافیدی و ئەوانەی ناوەڕاست و باشووری هنددا جیاوازییان هەیە. ئەوەندەی ئەو ڕەوکردن و دابەشبوونانە پەیوەندییان بە زمانی ئەو خێڵانەوە هەیە ئاشکرایە کە:

1. خێڵە هند و ئەوروپییەکان، لە پێش یەکەم دابەشبوونیاندا بە یەک زمان و چەند شێوەزارێکی لێکچوو و لێک نێزیک، بە پێی دوور و نێزیکییانەوە لە یەکتر، داخاوتن. وشە و زاراوە لە شوێنەواری ئەم یەکە زمانییە ماونەتەوە و هەندێکیان هەر ئەوەتا یەک نین و هەندێکیان لە بەکارهێنانیاندا لە یەک دەچن. ئەوەش چاوەڕوان دەکرێ نێزیکایەتی نێوان زمانی گەلانی ڕۆژهەڵات لە نێوان خۆیاندا لە یەکتر نێزیکتر بن بە پێوانە لەگەڵ زمانی گەلانی ڕۆژاوادا، بەڵام ئەوەش دەبێ کە

وشـەیەکی گەلێکـی ڕۆژهەڵاتـی کـۆن لە وشـەیەکەوە نێزیکتـر بـێ کە ڕۆژاوایـی بەکـاری دێنـێ، بـۆ نمـوونە وشـەی «ثـری Thri» ئاڤێسـتایی (کتێبـــی زەردەشـــت) لە کـــوردی ســـەردەمدا واتـــای ســـێ دەدا و لە ئینگلیزیشدا Threeیە.

2. نێزیکـایەتی نێـوان سانسـکریتی و زمـانگەلی گەلە ئێرانییەکـان لە سـەردەمە زووەکانی دابەشبوونی ئارییەکانـدا بـۆ دوو گەل، ئاشـکراتر و زەقتـرە. بە هـۆی کتێبـی «ڤێـدا Veda»ی هنـدی و هەنـدێ بەشـی ئاڤێسـتاوە ئەم نێزیکـایەتییە پـارێزراوە و کـۆنترین شـێوەی نووسـراوی سانسـکریتی و لقـی ئێرانـی زمـانی ئارییەکانیـانی هێشـتۆتەوە و وەختـە لێکچوونیان وەک لێکچوونی دوو جمک بێ.

3. لێکچوونی ئەو زمانانەی کە لقی ئێرانی گەلە ئاریەکان قسەیان پێ کـردووە، بەردەوام لە لێکچـوونی نێـوان ئەو زمانـانە و سانسـکریتی لە لایەکەوە، لەگەڵ زمانەکـانی لقـی ئەوروپـا لە لایەکـی تـرەوە زەقتـر و ئاشکراتر بووە. وا چاکە ئەوەشی بۆ زیاد بکەم کە ئایینی زەردەشتی، کە هەمـوو گەلە ئێرانییەکـانی گرتبـۆوە، یەکـێ بـووە لە هۆکـاری مـانەوەی لێکچـوون و نێزیکـایەتی لە نێـوان زمـانی ئەو گەلانەدا. واتە نێزیکـایەتی نیشتمانیان لە یەکەوە، تاکە هۆکاری گردەبڕی لێکچوونیان نەبووە.

ئەوەی لەم بوارەدا بۆ بابەتەکە گرنگە، پەیوەندی نێوان زمانەکانی گەلە ئێرانیەکـانە کە کـورد و فـارس لەوانەن و دوای دوو هەزار و پێنجسـەد ساڵ تەفروتونابوون و پاشکۆبوونی کورد، هێشتا ژمارەیەکی زۆری وشە لە نێوان کوردی و فارسیدا لێک دەچن. بۆ ئەوەی ئەم باسە ئەوەنـدە کورت بکەینەوە کە بابەتەکە نەشێوێ، دەبێ لە بەندی یەکەمی سەرەوە ببینەوە و لەو جێیەدا بۆی بگەڕێینەوە کە پێویستمان پێی دەبێ. دەبێ بە گوتەیەکی زۆر کـورت لە بەنـدی دوومیش ببینەوە، ئەوەش ئەوەیە کە

سانسکریتی هندی جمکی ئاڤێستای ئێرانییە، ئەوەش لەوەدا دەردەکەوێ کە ئەو زمانەی ڤیرای پێ نووسراوە، لەو زمانە دەچێ کە ئاڤێستای پێ نووسراوە. ئەم لێکچوونە دەگاتەوە ئەو وشە و ڕستانەی هەخامەنشیانیش کە لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی پێش زایینەوە پارێزراون. ئەو لێکچوونە دەگەیشتە هەموو زمانە ئێرانییەکانی تر کە لە سەر شێوازە کۆنەکەی تۆمار کرابێ و هێشتا هۆکاری گواستنەوە و گۆڕانکاری، خۆیان نەخزاندبێتە ناو بنیاد و دەربڕینیەوە. فارسی هەخامەنشی، لە ماوەیەکی کورتدا بەخۆی، بە شێوەیەک گۆڕانکاری بە سەردا هات، کە زاناکانی زمان بۆی ناچن و هیچ قسەکەرێکی زمانی دی چاوەڕوانی نەبووە. باسی ئەوەش دێ. لە بەر ئەوەی هیچ زمانێکی ئێرانی، جگە لە ئاڤێستا و هەخامەنشی، شێوازی نووسینی نەبوو تا لێکچوونە کۆنەکانی نێوان ئاڤێستا و هەخامەنشی و سانسکریتی دیاری بکەین. گۆڕانکاری نێوان سانسکریتی و ئاڤێستا بە پێی گۆڕانکاری لە دەنگەکانیاندا بووە. زۆر جار پیتی «س»ی سانسکریتی لە ئاڤێستادا بۆتە «ە»، «asura و spata و sndhu» لە ئاڤێستادا بوونەتە «ahura و hapta و hindu» و هەردوو وشەی «یەسنا و یەزنە» لە سانسکریتیدا بوونەتە «یەجنە و یەجتە»... و بەو شێوەیە. سانسکریتیش لە لایەن خۆیەوە، بە دەم ڕۆژگارەوە گۆڕا و بووە زمانێکی ناڕۆشن، ئیدی ئاساییە زیاتر لە زمانە ئێرانییەکان دوور کەوتبێتەوە.

تا ئێرە بۆ ئەم بابەتە بەسە.

ناتوانم بەو سەرچاوانەی بەردەستمەوە، بە وردیی سەردەمی کۆچکردنی خێڵە هندوئەورووپییەکان دیاری بکەم، چونکە شوێنەواری تۆمارکراو نییە دەریبخا یا بە ڕاستی بزانێ، ئەوانە یەئجووج و مەئجووج نەبوون کە لە کتێبە ئاسمانییەکاندا باسیان هاتووە تا بیکەینە بەڵگەی نێزیکییان لە سەردەمی تەوراتەوە، کە باسی کردوون. ئەوەندەی من ئاگادار بم، ئەوەش ناشێ کاتی ئەوە دیاری بکەین کە ئێرانییەکان لەو جێیانەدا نیشتەجێ بوون کە بۆی هاتن چونکە ئەو دەمەی ئەوە ڕوویداوە، هێشتا خێڵە هندوئەورووپییەکان، یا ئارییەکان، نووسینیان نەبووە تا بیکەنە دەفرێک بۆ ڕووداو و بابەتەکان و لە فەوتان و لەبیرچوون بیانپارێزێ. وام پێ خۆشە لە جێی خۆمەوە، بە سەر ئەو سەردەمەدا باز بدەم کە ئێرانییەکان لە وڵاتە تازەکانیاندا نیشتەجێ بوونە و هەر یەکە لەو خێڵ و گەلانە چ تایبەتمەندییەکی لەو وڵاتەدا هەبووە کە ئاوەدانی کردۆتەوە، چونکە ئەوانە پەیوەندییان بە سڕینەوە و کاریگەری هەر یەکەیانەوە بە سەر ئەوی تسرەوە نییە، مەگەر لە سنوورێکی بەرتەسکدا کە دەشێ پشتگوێ بخرێ، ئەوەش لە بەر هۆکارێک کە خەریکی ڕوونکردنەوەی نیم.

ڕەوی لقی ئێرانی لە خێڵە ئارییەکان بەرەو باشوور و باشووری ڕۆژاوا لەو دووڕییانەدا ڕووی دا کە بەر لە زیاتر لە هەزار ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح ڕووی داوە و یەکێکیان بووە هندی و ئەوی دی بووە ئێرانی. لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاین، مادەکان، یا میدیەکان (باپیرانی کورد) و پارس (فارسەکان) لە وڵاتی خۆیان بە تەنیشت یەکەوە نیشتەجێ ببوون و وڵاتیان گەیشتبووە ڕۆژاوای ئەوەی

ئێستا لە عورفی نێونەتەوەییدا پێی دەڵێن Persia، لە هەرە باکووریەوە تا ئەوسەری باشووری و بەشە باکوورەکەی هی مادەکان بوو و بەشە باشوورەکەشی هی فارسەکان و دراوسێتییەکی توندیان هەبوو کە لەو سەردەمەدا چ سنوور و بەربەست لە نێوان ذراوسێدا نەبووە و خەڵک و بەرژەوەندی بە ئازادییەکی مەیلەو ڕەهاوە لە هاموشۆدا بوون و پەیوەندی هەمەچەشنەی ناوەڕۆک هەمەجۆریان دروست دەکرد و بەردەوامییان پێ دەدا و ئەو شێوازە پەیوەندییانە، تا سەرەتاکانی سەدەی بیستەم لە ڕۆژهەڵاتدا بەردەوام بوو.

مەترسیدارترین و گەورەترین کاریگەری، لە ڕووی ماددی و دەروونییەوە لە سەر گەلی کورد، بە سەرسوڕمانەوە، ئەو نێزیکایەتییە توندوتۆڵەی بووە لەگەڵ پارسەکاندا. حوکمی لاوازی بە سەردا داوە و چارەنووسی دیاری کردووە و بەرەو خراپتر پاڵی ناوە، ئەوەش بە شێوەیەک کە هەتا ئەمڕۆکەی نەیتوانیوە لێی ڕەها بێ و نێزیکترین بەڵگە ئەم شتەیە کە دەیخوێنیتەوە لە بارەی بێ گەردیی زمانی کوردییەوە تا وشەی هاوشێوەی لە فارسیدا نەبێتە جێی گومان.

ئێمە پەیوەندیمان بە سەرجەم و بە درێژی باسکردنی بڵاوبوونەوەی ئێرانییەکانەوە لە وڵاتی خۆیاندا نییە چونکە ئەوە پەیوەندی بە گەلانی خۆیان و فەرهەنگ و کەلەپووری خۆیانەوە هەیە کە ڕۆڵی لە داڕشتنی زمانە ئێرانییەکاندا، بەو شێوەیە هەبووە کە بووە، بە تایبەتی و لە ناویاندا زمانی کوردی و فارسی، بێ ئەوەی بچینە ناو وردەکاری دەرەوەی بابەتەکە چونکە پێویستمان بە هەڵکۆڵینی بلوچی و سەغدی و سکائی و زمانی ئێرانی و ئارییایی و ئەو بابەتە زمانانە نییە کە ڕۆڵیان لە ڕێڕەوی ئەم دوو زمانەدا لە بیر چۆتەوە.

ئەوەش ڕوونە کە هێزی زمان لەگەڵ هێزی ئەو میللەتەدا کە قسەی پێ دەکا هاوسەنگە و سەرچاوەی هێزیش دەسەڵات و ئایینە چونکە ئایین، لە سەردەمە کۆنەکاندا کەلەپوور و فەرهەنگی بە شێوەیەکی گشتی لە خۆ دەگرت. بەم شێوەیە، بۆ هەوڵی تێگەیشتنی پەیوەندی نێوان کوردی و فارسی، ئەم زمانانە هی ئەوەن لێیان ورد بینەوە:

1. زمانی نووسینی ئاڤێستا 2. زمانی مادەکان 3. فارسی کۆن 4. پەهلەوی. لە ڕیزبەندیدا، من بە پێچەوانەی نووسەری کتێبی «تاریخ زبان فارسی ـ مێژووی زمانی فارسی» زمانی ئاڤێستام پێش خستۆتەوە. ڕەنگە ئەو لە ڕووی کاتەوە زمانی مادی پێش زمانی ئاڤێستا خستبێتەوە. بەڵام چ هۆیەکم بۆ ئەوە نەدیتەوە کە فارسی کۆنی پێش ئاڤێستا خستۆتەوە. هەرچۆنێ بێ، کێشەی تێکەڵاویی کوردی و فارسی لە خەیاڵدا نەبووە و پێم وا نییە گرنگییەکی ئەوتۆی بە ڕیزبەندی دابێ. من بۆ ئەوە چووم کە ئاڤێستا ڕۆڵی گرنگ و کاریگەری لە سەر قاڵبەندی کەلەپوور و فەرهەنگی ئێرانیدا هەبێ، ئەوەش لە مەودایەکدا کە لە هەزار ساڵ تێپەڕاندووە و جگە لەوەی کۆنترین بەڵگەنامەی نووسراوی میللەتە ئێرانییەکانە و ئەگەر «ڤێدا Veda»ی هند نەبووایە دەبووە کۆنترین بەڵگەنامەی نووسراوی هەموو گەلانی هند و ئەورووپی. ئەوجا ئەو بەشەی کە ناوی «گاتا gatha»ی لێ نراوە هی ئەوەیە تەمەنێکی زۆر لەو تەمەنە کۆنتری هەبێ کە زاناکانی بابەتە ئێرانییەکان بۆ دەرکەوتنی زەردەشتی خاوەنی ئاڤێستا دایاننـاوە و تەنانەت خاوەنی کتێبی «مزدیسنا وادب پارسی» لە لاپەڕەکانی 173 ـ 177 ی بەشی یەکەمدا ئەو جۆرە ڕایانەی دەربڕیوە کە لە سەر شتگەلێ وەستاون لە ئاڤێستادا باس کراون و هەندێ شتیش کە لە ئاڤێستادا باسیان نەبووە، بۆ پانزە سەدەی پێش زاین دەگەڕێنەوە و نە باسی مادەکان و

پارسەکانی تێدایە نە هێشتا دراو لێدراوە و نە چ شوێنەواری ئاسن و خوێ لە دەقەکانیدا هەیە... لێرەوە، کێشەیەک لە خەیاڵمدا پەیدا بوو و لە هەموو ئەو بەڵگەنامە مێژووییانەی کە خوێندوومنەتەوە وەڵامیم دەست نەکەوت، ئەوەش ئەوەیە ئەگەر گاتاکان ئەوەندە کۆن بن چ پەیوەندییەک لە نێوان گاتاکان و زەردەشتدا هەیە و ئەگەر لێکۆڵینەوە ماوەی چەند سەدەیەک زەردەشت نەگەڕێنێتە دواوە، ئەو قەومە کامەیە شارستانەتی ئەوەندە بەهێز بووە گەیشتبێتە ئاستی تۆمارکردن و خەیاڵ و لێکدانەوە و دەستووری وا داڕێژێ کە بە بەریانەوە هەبێ پەرە بسێنن و لە ئاڤێستادا هەبن؟ بەڵام نابێ ئەم کێشەیە ڕامانبگرێ چونکە ئەگەر هەندێ بەشی ئاڤێستا لە سەردەمی زەردەشت کۆنتر بێ یا بسەپێندرێ کە زەردەشت لەوە زووتر بووە کە بۆی دانراوە و بگاتەوە سەردەمی گاتاکان، ئاڤێستا هەر وەک حەقیقەتێکی گردەبڕ و وەک بەهێزترین کاریگەر لە سەر زمان و فەرهەنگ و ئایین و ژیانی هەموو ئێرانیەکانی پێش پەیدابوونی ئیسلام دەمێنێتەوە. دەبێ لێرەدا ئەوەش بگوترێ کە دانانی زمانی ئاڤێستا بە زمانی ئێران، جۆرە لێبوردەییەکی تێدایە بەرانبەر ئەو زانایانەی کە وای بۆ دەچن بە زمانی خەوارزمیەکان بێ، لەو جێیەدا (بە پێی بۆچوونی ئەوان) کە یەکەم جار زەردەشت تێیدا پەیدابووە. خەواریزم، بە پێی دەستنیشانکردنی خاوەنی «تاریخ زبان فارسی» کەوتۆتە باکووری دەریای «ئارال»ەوە کە هەردوو ڕووباری سەردایا و ئامودایا (سەیحون و جەیحون»ی تێ دەڕژێن (ل 201، تاریخ زبان فارسی بەشی یەکەم). ئەو ناوچانەش ئەمڕۆ ناویان کازاگستانی سۆڤیەتییە: ئاڤێستا لە جووت ناوی Airyana vaejah پێکهاتووە کە شوێنی ئەو خەڵکەن کە بەو زمانە قسەیان کردووە. ئەوجا زانای بابەتە ئێرانییەکان هاتن و ئەو ناوە و ناوی خەواریزمیان بە یەک

گرت، خەواریزمیش زۆر لە سنووری ئێرانەوە دوورە، ئەگەرچی دەچێتە ڕیزی واتای «ئاری، ئاریا»وە. بە پێی بۆچوونی ئەمانە، پێداویستی و زەرووڕەتی لۆژیکی وایان خواستووە ئاڤێستا بە زمانی ئەو خەڵکە بووبێ کە لە ناویاندا پەیدا بووە و خەڵکی تریش هەبوون، بەو شێوەیەی کە ڕوونی دەکەینەوە، بەو ئەنجامگیرییە ڕازی نەبوون.

زاناکان بە گشتی بەو دڵنیابوونە نەگەیشتن کە ئاڤێستا سەر بە گەلێکی دیاریکراو بێ ئەگەرچی لەوە دڵنیا بوون کە فارسی کۆن نییە و دوایی دێینە سەر باسی ئەوە. بەو ئەنجامگیرییەش نەگەیشتن کە لە سەردەمێکی دیاریکراو نووسرابێ و نەشیانتوانی تەمەنی بەشەکانی ئاڤێستا، بە دڵنیاییەوە دیاری بکەن و بیانگەڕێننەوە سەردەمێکی دیاریکراو، بەڵام لە سەرەڕێی چارەسەری کێشەکاندان و مەودایەکی باشیان لەو بوارەدا بڕیوە، کە ماندووبوونێکی گەلێ زۆر و ماوەی تێپەڕبوونی چەندین نەوەی ویستووە. پێم وا نییە کتێبێک بە گرنگیی ئاڤێستا بووبێ و تەمەنی زۆر بووبێ و بارودۆخی هەمەجۆری بە سەردا تێپەڕ بووبێ و دەستی تێکدانی پێ گەیشتبێ، لە کێشەی ئاوها خەلەسابێ.

کوشندەترین کارەسات کە لە هەموو سەردەمەکاندا بە سەر ئاڤێستادا هاتبێ، هەوڵی ئەسکەندەری مەکەدۆنی بوو لە دەوروبەری ساڵی 331ی پێش زاین، بۆ فەوتاندنی، ئەوەش دوای سەرکەوتنی بە سەر ئەخمینی (هەخامەنشییەکان)دا، چونکە دەستی بە سەر کتێبخانەی شاهانشاهیدا گرت کە هەموو بەشەکانی ئاڤێستای تێدا پارێزراو بوون. ئەو کتێبخانەیەی بە هەموو ئەو بەڵگەنامە نووسراوانەشەوە سووتاند و لە کۆتاییدا جگە لە هەندێ بەشی کەمی هیچی لە سووتاندن دەرباز نەبوو کە کۆیان 83000 وشە دەبوو و بەشە سووتاوەکانی تەنها لە بیری موبەد

و هەربەدەکاندا، ئەوە دوای ئەوە تا کۆتایی دەسەڵاتی سلوکی (سلوکس یەکێ بوو لە سەرکردەکانی ئەسکەندەر) مانەوە ئەوەش بە ڕزگارکردنی بەش لە دوای بەشـــی دەوڵەتەکە لە دەوروبەری 147ی پـێش زایـــن. (تەماشای خشتەی کاتەکان لە لاپەڕە 226ی کتێبی مزدیسنا و ادب پارسی بکە). ئەوجا هەوڵەکە تا کۆتایی سەردەمی ئەشکانیەکان، کە ساڵی 226ی زایینی بوو، درێژەی کێشا و لە سەردەمی دەسەڵاتی ساسانیشدا تا دەسەڵاتی خەسرەو پەرویز (590 ـ 627 ز) (لاپەڕە 228ی هەمان سەرچاوە). ئەوجا، دوای ئەوە ئیسلام هات و هەوڵەکانیش وێستان و تا ماوەیەک لاپەڕەی ڕۆشنبیری فارسی داخرا. دوایی ئەو هۆیە دیاری دەکەین بۆچی هەموو فەرهەنگی ئەو سەردەمە بە هی فارسی دانراوە.

ئەو بابەتانەی کە پەیوەستن بە وردەکاری ئایینی زەردەشتییەوە و لە ئاڤێستادا تۆمار کراون، ئەوەیە کە زەردەشت باوەڕێکی نوێی وای هێنایە ئـــاراوە، کە گەلە هنـــدوئەوروپییەکان و ئەو ئارییـــانەی کە بەرەو ڕۆژهەڵات جیاوەبوون، ئاشنایەتییان لەگەڵیدا نەبوو، چونکە فرەخواوەندی و سەربەخۆیی هێزی خێر و شەڕی لە شێوەی دوالیزم (دووخوایی) ڕەت کردەوە و تەنانەت واتای ناوە کۆنەکانیشی گۆڕی و ناوی «دێو Daava»ی کردە ناوی شەیتان کە پێشتر ناوی خواوەند بوو. ناوی «مەزدە ـ مەزدا Mazda»ی کردە خوای تاکی بەدیهێنی هەموو شتێ. هەمیشەش ڕاناوی Ahura بە دوایدا دێ و دەبێتە Ahura mazda کە واتای سەروەری مەزن دەدا.

مەسەلەی ئاڤێستا و ئەو زمانەی پێی نووسراوە و لە کوێ دەرکەوتووە و چۆن پەرشوبڵاو بوو و چۆن زندوو کرایەوە و سیاسەت لە سەردەمی ساسانییەکاندا چ ڕۆڵێکی لە گۆڕینی هەندێ لە حوکمەکانیدا، بە پێی

بەرژەوەندی دەسەڵات هەبوو تا دەگاتە ئەوەی ئاڤێستا بووە دوو: یەکێکی ڕەسمی بوو و ئەوی دی لە سینگی پیاوە ئاینییەکاندا مایەوە کە نەوە دوای نەوە دەیانگواستەوە. هەموو ئەوانە شتگەلێکن ژانیان کۆتایی نییە و لە کتێبی قەبەی دوور و درێژدا نەبێ جێیان نابێتەوە و ئەو ئاماژانەی پێشووتریش لە ڕووی پێویستییەوە بوون، چونکە پەیوەندییان بە بابەتە ورووژاوەکەوە هەبوو لە بارەی وشەی کوردییەوە.

هەر بۆ ڕەواندنەوەی کێشە ئەو زمانەی کە ئاڤێستای پێ نووسراوە ناو نراوە «زمانی ئاڤێستا» چونکە بەڵگەی گردەبڕی یەکلاییکەرەوەیان نەبووە تا بیدەنە پاڵ میللەتێکی دیاریکراو و موبەدەکان نووسینێکی ئاسانیان داهێناوە تا خوێندنەوەیەکی ڕوون بۆ دەربڕینی وشە نووسراوەکان هەبێ و ئەو نووسینەشیان ناو ناوە «دین دەبیری» واتە نووسینی ئایینی. وشەی «دەئین» لە ئاڤێستادا بە واتای ئایین هاتووە بەڵام «دەبیر، دەبیری» شیکردنەوەیەکی زیاتری هەیە: ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا لە «Dub دوب»ی سۆمەرییەوە هاتووە کە واتای «لەوحەی پارێزراو» دەدا و دوایی بە شێوەی duppu  tuppi گوازرایەوە لای ئەکەدیەکان و ئەوجا دوای ئەوەی گۆڕا و بووە «دوب» چووە ناو ئارامییەوە و لە عارەبیدا بووە «دوف». کۆنترین شوێنەواری ئەو وشەیە لە بەری ئێراندا بە شێوەی «دیپی dipi» دەبینین ئەوەش لە سەر بەردە هەڵکەندراوەکانی «بغستان ـ بێستوون»ی سەردەمی داریوشی یەکەم، لەساڵی چوارەم یا پێنجەمی دەسەڵاتیدا کە لە «522 تا 488 پ ز» ی خایاند هەڵکەندراوە. دوای ئەوە، ئەو وشەیە لە سەردەمی خشایارشای کوڕیدا «486 ـ 465پ ز» دەرکەوتەوە، ئەوەش لە سەر بەردی هەڵکەندراوی ناوچەی وانی کوردستانی تورکیا. وشەکە لە پەهلەویدا گۆڕا و بووە «دپیریە dipiri» و ئەوجا دەبیر و تا ئێستا لە

فارسیدا بەو شێوەیە ماوەتەوە. وشەکە، سۆمەری - ئەکەدی - بابلی - ئارامی - عارەبی - هەخامەنشی - پەهلەوییە و لە هندیدا «lipi و dipi»یە «ل. 109، 110، 111 لە فرهنگ ایران باستان». لە زمانی کوردیش، وەک ڕوونی دەکەینەوە دابڕا.

ئەو باسەی کە بۆی هەیە درێژە بکێشێ کورت دەکەمەوە و دەڵێم ئاڤێستا بە هەموو کەموکوڕییەکانیەوە قامووسی لقی ئێرانی گەلە ئاریەکانە و کەلەپوورێکە لێی دەوەشایەوە بۆ ئەو هەموو گەلانەی ئەو لقە بە بەرفرەوانی بمێنێ، جا کوردی بێ یا بلوجی یا فارسی یا هەرچییەکی تر بێ، لەگەڵ سەرنجدانی جیاوازی ڕێکەوت و هەڵکەوتی پەیوەندی هەر یەکێ لەو زمانانە بە ئاڤێستاوە، چونکە بەشی ئەو زمانانە، وەک دەردەکەوێ، لەو پەیوەندییەدا جیاواز بووە.

ئەوەی جێی داخە، وەک دەردەکەوێ، زانیاری برا عارەبەکان لە سەر وردەکاری ئاڤێستا و ڕۆڵی ئاڤێستا لە بارەی فەرهەنگی ئێرانی کۆنەوە، کە کورد یەکێکیانە، هەروەها لە بارەی ناوەڕۆکی ئەو پەیامەوە کە زەردەشت لەو کتێبەدا گەیاندوویەتی، بەشی ئەوە ناکا وێنەیەکی ڕوونی هەبێ. بۆم دەرکەوتووە کە دووەم خەلیفە، لە بەر زانیاری فرەوانی لە سەر هەندێ ئامازەی قورئان، یارانی زەردەشتی بە ئەهلی کتێب دانەناوە. کتێبی ئاڤێستا باسی یەکتاپەرستی و قەیامەت و زندووبوونەوە دەکا و مژدەی بەهەشت دەدا و هەڕەشەی دۆزەخ دەکا و ئەوەش بۆ ئەوانەی خوێندنەوەیان بۆ ئاڤێستا هەیە، ڕوون و ئاشکرایە و لە بازنەکانی دەرەوەی خوێندنەوەشیدا زانراوە و تەنانەت کتێبی «ئەڵلا»ی عەباس مەحموود عەقاد لە لاپەڕەی 88یدا دەڵێ:

«مەجووسەکانیش وەک میسرییەکان باوەڕیان بە قەیامەت بووە. هەروەها باوەڕیان بە پاداشت و سزای ڕۆژی قەیامت هەبووە، بەڵام

باسی زندووبوونەوە و کۆتایی دنیا و ڕۆحبەبەردا هاتنەوەیان بۆ ڕۆژی قەیامەت کردووە» لەمەدا وا دەردەکەوێ کە میسرییەکان باوەڕیان بە ژیانی قەیامەت هەبووبێ بەڵام باسی کۆتایی دنیا و ڕۆحبەبەردا هاتنەوەیان نەکردبێ.

دواتر لە هەمان لاپەڕەدا دەڵێ:

«جوولەکەکان باسی شەیتانیان لە پێش دیلکردنیان یا پێش بوونیان لە نێوان ڕووباراندا نەکردووە. دوای ئەوەی بە «اهرامان»ی مەجووسیانیان چواندووە کە نیشانەی شەڕ و خراپەکارییە، ئەوجا باسیان کرد»

پێشتر لە گۆڤارێکی ئیسلامیدا، پێم وابێ سەر بە وەزارەتی ئەوقاف بوو، بەر لە چەند ساڵێک خوێندمەوە، مەسەلەی زندووبوونەوە لە لای جوولەکەکان تا ڕۆژگاری دانیال پێغەمبەر بڵاو نەبۆوە. کەچی دەبینم مامۆستا عەقاد لە لاپەڕە 112ی ئەو کتێبەیدا ئەمە دەڵێ:

کتێبە ئیسرائیلییەکان باسی قەیامەت و زندووبوونەوەیان تێدا نەبووە و زەمینی ژێرەوە یا بیر یا «شیول» ئەو هەڵدێرە قووڵە بووە کە هەتیوان لە دوای مردنیان پەنای بۆ دەبەن و ئیدی لێی دەرباز نابن و «ئەوەی بەرەو هەڵدێر دابەزێ سەرناکەوێتەوە» و هەر ڕاست دوای ئەوە دەڵێ:

«یەکەم ئاماژە بۆ ڕۆژی «کەیوم - زندووبوونەوە» لە ئیسحاحی بیستوچوارەمی کتێبی «ئەشعیا»دا هاتووە کە لە سەدەی سێیەمی پێش زایندا ژیاوە.»

لە کۆتایی لاپەڕەی ناوبراودا ئەمەش دەڵێ:

له ئیسحاحی دوانزەهەمی کتێبی دانیالدا ئاماژەیەکی تر بۆ زندووبوونەوە و دادگای قەیامەت کراوە و ئەمەیان لە ئاماژەکانی پێشتر ئاشکراترە و دەڵێ: «زۆر لەو کەسانەی لە ناو خاکی زەویدا ڕاکشاون، بەخەبەر دێنەوە. هەندێکیان بۆ ژیانی هەمیشەیی و هەندێکیان بۆ سەرشۆڕی و شەرمەزاری هەمیشەیی». لە سەرەتای لاپەڕە 113دا دەڵێ: «مێژووی ئەم پێغەمبەرایەتییە بۆ کۆتاییەکانی (پێم وابێ ناوەڕاستی ڕاستە چونکە کۆتایی هەڵەی چاپە، یا دەبێ ساڵەکە 195 پ ز بێ. م.م) سەدەی دووەمی پێش زاین، ساڵی 195ی پێش زاین دەگەڕێتەوە. پێشتر پاداشت و سزای ئیسرائیلییەکان دەدرانە پاڵ دوژمن...»

لە قسەی شارەزایان وا دەردەکەوێ کاریگەری باوەڕی ئاڤێستا لە بارەی قەیامەت و زندووبوونەوەوە، لە سەر جوولەکەکان هەبووبێ چونکە لە دەمی بڵاوبوونەوەی ئایینی زەردەشتدا ئەوان لە بابل دیل بوون و کۆرشی هەخامەنشی کە ساڵی 539 پ ز بابلی داگیر کرد، ئازادی کردن.

بەڵام ناونانی لایەنگرانی زەردەشت بە «مەجووس» چیرۆکێکی کورتی هەیە و ڕوونی دەکاتەوە: لایەنگرانی زەردەشت و ئەوانەی باوەڕیان بە دینەکەیان هەبوو بە «موغ» ناو دەبران و یۆنانییەکانیش بە پێی دەربڕینی وشە ڕۆژهەڵاتییەکان و پێوانەی خۆیان لە گۆڕینی وشەدا کردیانە «ماگیوس» و ئەمەش گۆڕا و بووە «مەجووس». لایەنگرانی زەردەشت بە شێوەیەکی گشتی ناوێکی تریان هەیە و هەموویان دەگەڕێتەوە و بە تاکەکانیان ناگوترێ. ئەوان بە خۆیان دەگوت «بەدینان» واتە خاوەنی ئایینی ڕاست و ئەلف و نوونی «بەدینان» نیشانەی کۆیە. ناوێکی تریشیان هەیە کە بە لای خۆیانەوە ناسنامەیان باشتر دەردەخا، ئەویش «مەزدیەسنا»یە. ئەم وشە

تـــێکەڵەش واتـــای «مەزدپەرســـت» دەدا و بەرانبەرەکەشـــی «دێویەسنا»یە، کە دەکاتە شەیتانپەرست.

ئەوە کورتەیەک بوو هەر دەبوو بگوترێ تا بابەتەکە لە تاریکی بێتە دەرێ.

ماده‌کان یا میدیه‌کان - باوباپیرانی کورد، له باکووری ڕۆژهه‌ڵاتی وڵاتی ئێران نیشته‌جێ بوون و سنوور به سنووری وڵاتی پارسه‌وه بوون که که‌وتبوونه لای باشووریانه‌وه. یه‌که‌م پاشای ئاشووری که ناوی ماده‌کانی له نووسیندا هێناوه شه‌لمانسه‌ری دووه‌م بوو که ساڵی 844 پ ز سه‌رزه‌مینی ماده‌کان (کوردستانی ئێرانی ئه‌مڕۆ)ی داگیر کرد و دواتر، دوای حه‌وت ساڵ دیسان داگیری کرده‌وه و له هه‌واڵه‌کاندا به Made - Madai ناوی هێناون. له سه‌رده‌می شه‌مس ئادادی چواره‌میشدا، که کوڕی شه‌لمانسه‌ری ناوبراو بوو، ناویان هاتووه. دوای ئه‌وه، ئه‌داد نیراری سێیه‌م ساڵی 810 پ ز داگیری کردن و تیکلات بلیسه‌ری چواره‌م که به شه‌ڕکه‌ر ناوبانگی هه‌بوو، ساڵی 744 پ ز وڵاتی لێ داگیر کردن. سه‌رجۆنی سێیه‌میش ساڵی 722 پ ز چووه سه‌ریان و ماده‌کان له‌و سه‌روبه‌ندانه‌دا خۆیان له حکوومه‌تێکی ڕێکوپێکدا یه‌کنه‌خستبوو تا دیاکۆ «دیکۆ» یۆنانیه‌کان به Deikos ناویان ده‌برد، ساڵی 713 پ ز بۆی هه‌ڵکه‌وت و ده‌وڵه‌تێکی پێکهێنا و «هه‌مه‌دان»ی کرده پایته‌خت و ئه‌وه‌ش تا ئه‌و ده‌مه، یه‌که‌م ده‌وڵه‌تی هه‌موو گه‌له ئێرانیه‌کان بوو. سێیه‌م پاشای ماده‌کان Hovakhshtra هوڤه‌خشترا که یۆنانییه‌کان به Cyaxares ده‌ریانده‌بڕی، یه‌کێ بوو له گه‌وره شه‌ڕکه‌ر و داگیرکه‌ره‌کان و زۆر له وڵاته دراوسێکانی خسته ژێر ڕکێفی خۆیه‌وه تا له ساڵی 612 پ ز توانی به هاوکاری بابلیه‌کان نه‌ینه‌وای پایته‌ختی ئاشووریه‌کان داگیر بکا و ناوی ئاشووریه‌کان له تۆماری ده‌سه‌ڵاتدا بسڕێته‌وه (خاوه‌ن تاریخ زبان فارسی، ساڵی 610ی پ زی گوتووه). دوای ئه‌م داگیرکردنه، ناوی ماده‌کان و ئێرانییه‌کان بڵاو بووه‌وه. ئه‌و پاشایه مرد و

ساڵی 584 پ ز ئەو کوڕەی جێی گرتەوە کە لە نووسینی بابلییەکاندا بە « Ishtovygo»[1] ناوی براوە و (لە یۆنانیدا Astyago)یان پێ گوتووە. لە سەردەمی ئەمدا، بە دەستی کۆرشی گەورە کە کچەزای ئاستیاگ خۆی بوو، دەوڵەتی ماد کۆتایی هات. کۆرش ساڵی 539 پ ز بابلی داگیر کرد (فرهنگ ایران باستان ل 103 ـ 106).

پاشاکانی ماد، هیچ شوێنەوارێکی نووسراویان بە زمانی خۆیان جێ نەهێشتووە تا بیکەینە بەڵگە و خەسڵەتەکانی ئەو زمانە دەستنیشان بکەین کە لە سەردەمی ئەواندا لە ناو تاکەکانی گەلی ماد یا کورد باو بووە و جگە لە هەندێ ناوی پاشاکانیان کە لە نووسراوی میللەتانی تردا باسیان هاتووە، هیچیان لێ بەجێ نەماوە. لێرەوە ئەو بڕیارە زەحمەت دەبێ چەند پەیوەندی لە نێوان زمانی کوردی و ئاڤێستادا هەیە یا تا چ ئاستێک دەقاودەقن. هەندێ لە زاناکان بۆ ئەوە دەچن کە ئەو ناوە کەمانەی میدیەکان پەیوەندییان بە زمانی ئاڤێستاوە نییە و دەڵێن دەقاودەق نین. لەوەشدا زێدەڕۆییان کردووە کە گوتوویانە زەردەشت بەخۆی خەڵکی ناوچەی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران بووە کە ئاڤێستای لێ دەرکەوتووە و بەوەش پێناسەی میدییان لێ سەندۆتەوە. بەڵام سەرجەمی قسەکانیان هی ئەوە نییە باوەڕی پێ بکرێ بە تایبەتی لە بارەی ڕەچەڵەکی زەردەشتەوە چونکە بە پێی بۆچوونی کۆنترین

[1] . ئەو قسەیە هەیە کە ئەستیاگ، هەمان ئەو «ئەژدەهاک»ە بووبێ کە کاوە «لە ڕاستیدا کۆرش» کوشتوویەتی و بە کوژرانی ئەویش کۆتایی بە دەسەڵاتی باوباپیرانی کورد هاتووە و لەوساوە ئاهەنگ بۆ ئەو تێکشکانەی خۆمان دەگێڕین. فارسەکان وایان بڵاوکردەوە کە ئاستیاگ سێ سەری هەبووە، دواییش دوو لەو سەرانەیان لێ کردە مار بە سەر شانیەوە!! ئاهەنگی نەورۆزیش بابەتێکی ئاینی بووە و تیایدا پێشوازی لە ڕۆحی باوباپیران کراوە و لە سەری ساڵدا، بە ئاگرکردنەوە، بەرەو بەهەشت بەڕێ کراونەتەوە. من بەشبەحاڵ، بە نیازی پێشوازی کردنی ڕۆحی باوباپیران پێشوازی لە نەورۆز دەکەم و بەڕێی دەکەم. ح.ک

مێژوونووسانی ئەو گەلانەی کە بە دوای یەکدا هاتوون، زەردەشت خەڵکی باکووری ڕۆژاوای ئێرانە و لە ناوچەی «ڕی Regha»ی کۆن بووە و ئەوجا کۆچی زەردەشت بەرەو ئەو شوێنەی کە پاشاکەی پەنای داوە و لەوێ ئایینەکەی بڵاو کردەوە، پێ دەچێ لە ڕۆژاوای ئێرانەوە بووبێ تا ڕۆژهەڵاتی، یا باکووری ڕۆژهەڵاتی. لە ڕووی بەڵگەی ناوەکانیشەوە، ناوی تری میدی کە لەگەڵ ئەو ناوانەدا دەقاودەقن و لە ئاڤێستادا باسیان هاتووە، وەک ناوی Koshtaspi کە لە نووسراوە بزمارییەکاندا لە هەندێ ناوچەی ئاسیای بچووکدا هاتووە کە شوێنەواری تیکلات بلیسەری شای ئاشووریان بووە بۆ ساڵی 854 پ ز دەگەڕێتەوە. ئەو ناوە هەمان «گوشتاسەپ»ە کە لە ئاڤێستادا وەک پارێزەری زەردەشت ناسراوە و بۆ سەدەی حەوتەمی پێش زاین دەگەڕێتەوە و خەڵکانی تریش لە هەخامەنشیەکانی دوادوایی بەوەیان زانیوە، لەوانە باوکی داریووشی یەکەم کە 521 پ ز تا 485 پ ز دەسەڵاتی هەبووە.

ناوێکی گردەبڕی تر هەیە کە دەمەتەقێ یەکلایی دەکاتەوە، ئەوەش ناوی باوکی زەردەشتە کە لەگەڵ ناوی دایکیدا لە عیبارەتێکی ئاڤێستادا هاتووە و دەشێ ئاوها وەریبگێڕین: «ئەی زەردەشت پوروشپە و دۆغدۆ و هیربەد ئازار مەدە (ل 90 مزدیسنا و ادب پارسی) پوروشپە باوکی زەردەشت بووە و دۆغدۆ دایکی بووە و میربەدەکان، پیاوە ئایینیە شارەزاکان بوونە. پوروشپە لە دوو بەش پێکدێ، یەکەمیان «Pouroush پوروش»ە و بە پێی قسەی زاناکان دوو واتای هەیە، یەکێکیان «پیر»ە. وشەی پوروش کورت کراوەتەوە و گۆڕاوە تا بەو واتایە بۆتە «پیر»ی کوردی و فارسی. واتای دووەمی، ڕەنگی تێکەڵی ڕەش و سپییە و ئەگەر ڕەشەکەی زاڵ بێ، لە عارەبیدا دەبێتە «ادهم» و ئەگەر سپییەکەی زاڵ

بێ، له عارەبیدا دەبێته «اشهب». سەرچاوەکان له ئاستی چارەنووسی ئەو وشەیەدا بەو واتایە، بێ دەنگن و نالێن بەرەو چی گۆڕاوە، چونکە هاوشێوەی له زمانه ئێرانییەکاندا نازانن که خەریکین و ئەگەر کوردییان بزانیبا وێنەیەکی زندوویان دەست دەکەوت که وشەی «بۆر»ی نێزیکی «سپی بۆر»ی «اشهب»ی عارەبییه و «ڕەش بۆر»یش «ادهم»ی عارەبییه. ئەوەش ڕوونه که وشەی «بۆر» له «بوروش»ەوە وەک «پیر» نێزیکه. وشەی دووەمی ناوەکە، «ئەسپ، ئەسپە»یه که واتای «ئەسپ» دەدا و زاناکان گوتوویانه که هەموو وشەکە دەکاته «خاوەنی ئەسپی ڕەشبۆر». جگە لەوەش تەمەنی ئەسپی پیر ئەوەندەی به دەمەوە نابێ و ئەوەندەی ماوەتەوە بایی ئەوە ناکا ببێته نازناو. له سەر واتای ئەو ناوانەشەوە، کۆچی زەردەشت بۆ وڵاتی تر، له دەقی ئاڤێستادا تۆمار کراوە و باسی ئەو دەردەسەریانە کراوە که به دەست کەسوکاری به سەریدا هاتوون و ئەو ڕێیەی بەو سەرماوسۆڵەی زستانە که خۆی و ئاژەڵەکانی گرتوویانەته بەر، به ڕێڕەوی زستان «پەرەتۆزەمۆ» pareto zemo ناوی هاتووە. ئەو (کەی ڕاستییەکە kavi کەڤی نازناوی دەسەڵاته) جێیان نەکردۆتەوە و ناچار بووە به زەمهەریردا له سەر سەفەر بەردەوام بێ تا گەیشتۆته Tosa (دوایی بۆته توس). هەرچۆنێ بووبێ، گەیشته ئەو جێیەی لێی بووە میوان و مایەوە و ئایینەکەی تێدا بڵاو کردەوە و چ پێویست به دڵەڕاوکێ له بارەی ئەو ڕاستییه مێژوییەوە ناکا که لەگەڵ ئاڤێستادا دەقاودەقه. ئەگەر باسه مێژووییەکە له بارەی کۆچەکەوە ڕاست بێ، بۆچی دەبێ ناوی ئەو شوێنەی لێیەوە ڕۆیشت درۆ بێ؟ ئەو زانایانەی که زەردەشت بۆ مادەکان دەگێڕنەوە بەو لایەدا دایدەشکێنن که زمانی نووسینی ئاڤێستا زمانی ئەو بووبێ، واته ئەو وڵاتەی که تێیدا پەروەردە بووە، چونکە ناشێ

کەسێکی ڕێڤنگ بگاتە لوتکەی دەربڕین بە پێوانەی ئەو سەردەمانەی کە لە ئاڤێستادا هەیە. ئەگەر خاوەنەکەی زمانی خەڵکی تری بەکارهێنابێ ئەوەش بیانوویەکە بە هاسانی بەرپەرچ نادرێتەوە چونکە جێدەستی هێزمان دیت کە زەردەشتی ناچار کرد وڵاتەکەی خۆی بەجێ بهێڵێ هەر لە بەر ئەوەی داوای لە خەڵکی کردبوو نەفرەت لە خوو و ڕەوشتی زاڵم لە هەندێ بواری ژیاندا بکەن و بە دەم گەیاندنی پەیامەوە کۆچی کرد و ئەوەندە مۆڵەتی نەبوو بە شێوەیەک فێری زمانێکی بێگانە بێ پەیامەکەی پێ بگەیەنێ. لە سێبەری گوشتاسپدا مایەوە و دەستی کرد بە گەیاندنی پەیامەکەی. ئەگەر ئەم بەڵگانە ئەوانە بێدەنگ نەکەن کە حاشا دەکەن، چ بەڵگەیەکی دی بۆ پێناسەی ئاڤێستا لەمە گردەبڕتر لە ئارادا نییە تا باوەڕ بێنن. ئەوەی دەبێ لێرەدا بگوترێ ئەوەیە وشەی pareto کە دەلالەت لە ڕەتبوون دەکا، لە ڕیشەدا «پار par»ە لەوە تێناپەڕێ کە وشەی «پەڕ»ی کوردی بێ کە دەکاتە «ڕەتبوون» ئەگەر «تێ»ی لە پێشەوە بێ ببێتە «تێپەڕ»ی کوردی. بەڵام «Zamo زەمو» کوردی و فارسی لێی هاوبەشن و لە فارسیدا «زمستان»ە و لە کوردیدا «زمسان و زستان»ە ئەوەش بە گوێرە جیاوازی شێوەزار و لە هەردوو زمانەکەدا «ستان» بۆ زۆر وشەی گرنگ دەکەنە پاشکۆ «ئەم بەڵگانە لە منەوەن نەک سەرچاوەکان»

قسە لە بارەی ئاڤێستا و پەراوێزەکانیەوە کۆتایی نایە بۆیە هەر بەو تایبەتمەندییانەی سەرەوە واز دێنم، بەڵام لە سەر کاریگەری و ڕووداوەکانی دەوروبەری و قسەی زانایان لە بارەیەوە بەردەوام دەبم و یەکەم جار دەڵێم زۆربەی زاناکان خوراسانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێرانیان بە وڵاتی دووەمی زەردەشت داناوە، ئەوەش دوای ئەوەی وڵاتی خۆی «ماد»ی بەجێ هێشت. خوراسانیش لە ناوەڕاستی سەدەی

سییەمی پێش زایندا وڵاتی «پارت»ەکان بووە و دەوڵەتی ئەشکانییان تێدا دامەزراندووە. ئەگەر ئەو بۆچوونەی ئەوان ڕاست بێ، دەسبەرداری ئەوە دەبم کە زەردەشت و ئاڤێستا لە خەوارزم دەرکەوتبن. بە ڕای من، لە بارودۆخی کۆچی زەردەشتدا، ئەو مەودا دوور و درێژە و بەو چلەی زستانە لە وڵاتی مادەوە لە توانای خێزانێکی دەرکراو بە دەرە. مەودای نێوان وڵاتی کورد و خەوارێزمم لە سەر نەخشە پێوا و بینیم، لەگەڵ سەرنجدانی ڕێگای پاشایانە دوو جار لە درێژایی نەخشەی عیراق درێژترە و نەخشە نە پێچی تێدایە نە هەوراز و نشێو یا شیو و شاخ، بەڵام ڕێگا هەموو ئەوانەی تێدان. مەوداکە بۆ خوراسان نیوەی مەودای خەوارێزمە و ئەمەش وا دەکا کە پەیوەندی نێوان ئاڤێستا و فەرهەنگی ئێران پتەوتر بێ.

گوتمان پاشاکانی ماد چ نووسراوێکیان لە پاش خۆیان جێ نەهێشتووە و زمانێکیش دەقێکی وای نەبێ دەستووری زمان و دەربڕینی بپارێزێ بۆی هەیە بە درێژایی ڕۆژگار و بە هۆی دووری خێڵەکانی لە یەکترەوە، لقوپۆی شێوەزاری لێ بکەونەوە بێ ئەوەی پێوانەیەکیان هەبێ لە کات و دووریی شێوەزارەکان لە ڕیشەی خۆیانەوە، بۆی بگەڕێنەوە و جگە لە ئاڤێستا هیچی ترمان نییە بۆی بگەڕێینەوە بۆ ئەوەی بزانین زمانی مادە کوردەکان، لە ڕووی شیکردنەوە و جۆرەوە چ گۆڕانکارییەکی بە سەردا هاتووە و لە ماوەی ئەو بیستوپێنج سەدەیەدا چۆن گەشەی کردووە. ئەگەر ماوەیەک ئاڤێستا لە بیر بکەین، دوو سەرچاوەی ترمان هەیە کە بۆ ئەوە بشێن بکرێنە پێوانە بۆ زانینی ڕادەی ئەو گۆڕانکارییە چاوەڕوانکراوانەی کە لە سەردەمی مادەکانەوە بە سەر زمانی کوردیدا هاتووە. ئەو دوو سەرچاوانەش پارسی هەخامەنشی و پەهلەوین: فارسی سەردەم کە سەرچاوەکەی پارسی هەخامەنشییە ئەوەندە لە ڕەگی خۆی

دوور کەوتۆتەوە، خەریکە لێکچوون لە نێوانیاندا نەمێنێ. هەخامەنشی زۆر لە ئاڤێستاوە نێزیکە، چونکە سەردەمیان لە یەکەوە نێزیک بووە، زۆریش لە فارسی سەردەمەوە دوورە چونکە سەردەمیان زۆر لە یەکەوە دوورە و ئەگەر پەهلەوی لە نێوان فارسی کۆن «هەخامەنشی» و فارسی ناوەندی و تازە نەبوایەتە پردێک، جیاوازی نێوانیان ئەوەندە زۆر دەبوو لە هیچ بۆچوونێکدا جێی نەدەبوو. لە شوێنەوارە تۆمارکراوەکانی هەخامەنشی، کەمێ لە 400 وشە پتر ماوەتەوە، ئەوەش بۆ ڕوونکردنەوەی زۆر لایەن بەش دەکا: یەکەمیان و گرنگترینیان ئەوەیە زمانی ئاڤێستا جیاوازی لەگەڵ فارسی کۆندا هەیە و یەک نین. دووەمیان ئەوەیە کە نێزیکایەتی نێوانیان، ئەو دەرفەتە دەدا کە بۆ هەندێ وشە و دارشتن بۆ هەخامەنشی ونبوو بگەڕێینەوە. سێیەمیان، لە ماوەیەکی ڕێژەیی کورتی دەسەڵاتی سلوکیدا گۆڕانکارییەکی گەورە و شیوێکی قووڵ کەوتە ڕێزمان و شیکاری فارسی کۆنەوە چونکە پەهلەوی دوای سلوکییەکان بە شێوەیەک دەرکەوت کە زۆر لە هەخامەنشی و ئاڤێستا جیاواز بوو و پەهلەوی هاوکف و دەستەخوشکی فارسی ناوەنجی بوو و دەکرا فارسی لەگەڵدا پێوانە بکرێ چونکە فارسی ناوەنجی لە سەردەمی سلوکیدا و لە ماوەی دەسەڵاتی ئەشکانییەکاندا شێوازی نووسینی هەبوو. ئەوانەش مەسەلەگەلێکن پێویستیان بە لێکۆڵینەوە هەیە و لێرەدا جێی نابێتەوە، بۆیە هەر بەوەندە دەسبەردار دەبم کە لەو چەند دێڕەی سەرەوەدا باسم کرد، ئەوەش بۆ ئەوەی بگەمە ئەو ئەنجامەی کە کوردی، لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی نەبوونی سەرچاوەی نووسراوەوە، لە سەرچاوەی تۆمارکراوی خۆی دابڕاوە (بەو حسێبەی کە ئاڤێستا کوردی نەبێ)، پێوانەکاری ئەو مافە دەدا بە جۆرێ بیر لە بنەمای کوردی بکەینەوە کە بە قەدەر گونجانی فارسی کۆن لەگەڵ بنەماکەیدا بگونجێ

و ئەو سەرنجەشی بۆ زیاد دەکەین کە کوردی بۆی هەڵنەکەوتووە پەیوەندی بە سەرچاوەی خۆیەوە بمێنێ، وەک بۆ فارسی هەڵکەوتووە، ئەوەش ڕاستییەکە یارمەتی توێژەرەوە دەدا کە لەگەڵ کوردیدا، کە مێژوو ماوەی 25 سەدە غەدری لێ کردووە، بە ویژدان بن. ئەگەر کێشانە و پێوانە بکەین دەبینین ئەوەندەی کوردی بە ئاڤێستاوە وابەستەیە، فارسی نوێ بە فارسی کۆنەوە وابەستە نییە و بەڵگەی سەرباریشمان بۆ ئەم بۆچوونە هەیە کە پەیوەندییان لە ڕووی زمانەوانی و شیکارییەوە پرد لە نێوان کوردی و ئاڤێستادا دروست دەکا.

لەوانە، پاشگری «نات» لە ئاڤێستادا کەرەسەیەکە ناو دەکاتە ناوی واتا (اسم المعنی). شێوەی ئەمە لە فارسیدا نییە بەڵام لە کوردیدا هەیە و لە شێوەدا لێی نێزیکە و لە ئەرکدا وەک یەکن، ئەوەش ناوی واتایی «ئەتی، ایەتی، تی». ئەوە پاشگرێکە سێ شێوەی هەیە و پەیوەندی بە پێکهاتەی ئەو وشەیەوە هەیە کە لە ڕووی ڕێزمانییەوە پێشی دەکەوێتەوە. وشەی «ئامر، تات» لە کوردیدا دەگۆڕێ و دەبێتە «نەمرایەتی، نەمرەتی» بە واتای نەمریی. «ئە»ی وشەی یەکەم بۆ نەفییە و لە دووەمدا «نە» بەرانبەریتی و «مر» لە هەردوکیاندا مردنە و «ئەمر، نەمر» دەبنە نەمردن. ئەوجا «تات» لە یەکەمدا و «ایەتی، و ەیەتی» بۆ جیاکردنەوەیە و واتاکە دەبێتە «نەمریی، نەمردن - نامردن». لەم دەرفەتەدا ئەوە دەڵێم کە ئەو «ئا»ی نەفیکردنە لە ئینگلیزیشدا هەیە: sexual و asexualو هی تریش زۆرن و لە سەردەمی پێش دابەشبوونی خێڵە هند و ئەوروپییەکانەوە ماونەتەوە. بەڵام ناتوانم سەرم لەوە سوڕ نەمێنێ کە ئەو «ئە»یە لە عارەبیشدا لە سەر شێوەی «افعل - ئەفعەلە» دەسبەردان دەگەیەنێ، وەک «افلس - ئەفلەسە» و «اعذر - ئەعذەرە» و بیانوو بە دەست

پیاوەوە ناهێڵێ. ئایە ئەمە ڕێکەوتە یا دراوسێتی سامی و ئاری کاریگەریی خۆی هەبووە؟

نموونەی تریش لە سەر پاشگر کە هاوشێوەیە، ئەوەیە کە زۆر وشەی ئاڤێستا لە فارسیدا نین کەچی لە کوردیدا هەن، وەک وشەی «pasu پەسۆ» بە واتای مەڕ کە لە فارسیدا نییە و لە کوردیدا لە سەر شێوەی «paz پەز» هەیە. لە لاپەڕە 305 و 306ی «فرهنگ ایران باستان»دا، پوور داود دەڵێ: وشەی vareghan ڤارێغان لە کوردیدا «پاڵەوان»ە ئەوەش ناوی پەلەوەرێکی گۆشتخۆرە کە لە باز بچووکترە و وشەی لەو بابەتە لە فارسیدا نییە.

لە بارەی «ڤارێغان و پاڵەوان»ەوە، دەبێ ئەوە بگوترێ کە دەنگی «v» لە ئاڤێستادا، لەگەڵ تێپەڕبوونی کات، لە کوردی و فارسی و زمانی تردا گۆڕاوە و بۆتە چەند دەنگێکی وەک «ب»، «ر»یش بۆتە «ل»، «غ»یش بۆ دەنگی تری وەک «ز» و «ز»ی فارسی، لە زۆر وشەدا و لێرە بە پێی دەستووری دەنگگۆڕین گۆڕاوە. «و» بۆتە «ڤارغن» و «پاڵەوان». لە ئاڤێستاییدا دەنگی «ل» هەر لە بنیی نییە و لە هەخامەنشی و پەهلەویدا بەر چاو دەکەوێ و پێ دەچێ دواتر پەڕیبێتە ناو زمانی کوردی و زمانە ئێرانییەکانی ترەوە. تەنانەت شاخی «برز»ی باکووری تاران لە ئاڤێستادا بە «Hara berezaiti» هاتووە و لە کوردیدا وەک خۆی دەبێتە «هەرە بەرزایەتی» و لە فارسیدا وەرگێڕانی لەو شێوەیە نییە.

نموونەی وشەی «haurva هورڤە» بە واتای «تەواو، بێ کەموزیاد»ە و ئەمەش ئاڤێستاییە و وێنەیەکی لە کوردیدا ماوە بە هەمان واتا، ئەوەش وشەی «ئیرۆ»یە. لابردنی وشەی «ە» لە سەرەتای وشەی کوردیدا دیاردەیەکی باوە و گەلێ جار دەبێتە هەمزە و بەو پێیە، ئەو وشەیە

دەبێـتە «aurva» و «v» دەگـوترێ و دەبێـتە «و». ئەوەش بە پێـی دەستوورێکی تری دەنگ و نێزیکایەتی نێوان ئەو وشـەیە و «ئیـرۆ»دا. وشەیەک کە تەمەنی سێ هەزار ساڵ بێ ئەوەندەی هەر بە سـەردا دێ و ئەو وشەیە لە فارسیدا نییە.

هەروەهـا وشـەی «vizm» کە بە واتـای «خـزم» دێ، بە پێـی گـۆڕینی دەنگـێ «v» بـۆ دەنگـی تـر لە بـابەتە ئێرانییەکانـدا، لە کوردیـدا بۆتە «khizm». دیتیشمان چۆن «ڤشتاسپ» گۆڕا و بووە «گشتاسپ». وێنەی ئەم وشەیەش لە فارسیدا نییە.

وشـەی «azan ئەزەن» بە واتـای «خـۆر» لە ئاڤێسـتادا هەیە و لە کوردیدا بۆتە «گزنگ» بە واتای تیشکی خۆر لە کاتی بەیانیـدا و هیچ شتێکی تر، جگە لە خۆر، بۆ ڕۆشنایی بەکار نەهاتووە. لە وێنەی ئەمەش لە فارسیدا نییە.

لە وشـەی «uzayeirina»ی ئاڤێسـتادا کە خۆراوابـوون دەگەیەنـێ، سەرەتاکەی «uz ئەز»ە هەمـان وشـەی «وزە»ی کـوردی سـەردەمە و واتـای وزەی بەرزکـردنەوە دەدا و لە ئاڤێسـتادا بە هەمـان شـێوەیە و لە فارسیدا بوونی نییە.

«shapik» چاکەتێـک بـووە گەنجـی زەردەشـتی، کـاتێ گەیشـتوونەتە تەمەنێکی دیـاریکراو لە بەریـان کـردووە. ئەم وشـەیە بە هەمـان واتـا و شـێوە لە کوردیـدا هەیە بەڵام چ پەیوەنـدی بە ڕێوڕەسـمی ئـایینی زەردەشتییەوە نییە، چاکەت و بڕایەوە. ئەمە لە فارسیدا نییە و نەبوونی زۆر سەیرە.

وشەی «دختر»ی فارسی کە لە ئینگلیزیدا «doughter» بەرانبەرێتی لە زمـانە ئێرانییەکانـدا «Dughdu» بـووە و نـاوی دایکـی زەردەشـتە و

ئێمە لێی بێ بەشین و جگە لە ناوچەیەکی بەرتەسک کە «دۆت» بەکار دێنن، بەکاری ناهێنین.

وشەی «rapithvina ڕاپثڤینا» لە ئاڤێستادا دەکاتە کاتی نیوەڕۆ و چی دی، نە لە کوردیدا بەکار دەهێندرێ نە لە فارسیدا، بەڵام لە کوردیدا وشەیەکی تر هەیە کە «فراڤین»ە و دەکاتە ژەمی نیوەڕۆ و نێزیکایەتی لەگەڵ ئەو وشەیەدا ئاشکرایە:

ڕاپثڤین کاتی نیوەڕۆ
فراڤین ژەمی نانخواردنی نیوەڕۆ

ئاشکرایە ونبوونی یەکەم لە کوردیدا، وەک وشەی «ئەز ئایەرینە» کە کاتی ئاینییە و بە ژمارە پێنجە، بۆ ونبوونی ئایینی زەردەشتی دەگەڕێتەوە.

دەشێ بەو جۆرە وشانە درێژە بە لستەکە بدەین بەڵام ئەوە بە پێویست نازانین و لە گۆشەیەکی ترەوە دەڕوانین کە ئەوەش گۆڕینی دەنگە لە وشە ئێرانییەکان و زۆر وشەی سەر بە ئاڤێستا، دەبینین هەندێ لە دەنگەکانی خۆیان لە وشە کوردییە هاوشێوەکانیاندا پاراستووە، ئەوەش بە پێچەوانەی فارسییەوە. یەکێ لەو وشانە «zrayah زرەیە»یە بە واتای زەریا و لە کوردیدا بۆتە «زەریە» و لە فارسیدا بۆتە «دەریا». وشەی «zamatar زاماتەر» کە زاوایە، لە کوردیدا بۆتە «زاوا» و لە فارسیشدا «داماد»ە. وشەی «asu»ی ئاڤێستایی بە واتای مامز لە کوردیدا بۆتە «ئاسک» و لە فارسیشدا «اهو». وشەی «مسیە»ش بە واتای ماسی، لە کوردیدا «ماسی»یە و لە فارسیدا «ماهی»یە.

وشــەی «vahrka ڤەهــرکە» لە ئاڤێســتادا گــورگ دەگەیەنــێ و ئێســتا گونـدێک لە نێزیکی هەولێر بە نـاوی «بەحـرکە»ەوە هەیە. ئەو وشـەیە گــۆڕا و لە هەردوو زمــانەکەدا بــووە گــورگ، بەڵام شــێوەزاری زازایــی کوردی «ڤ»ەکەیان هێشتۆتەوە بە «verg ڤەرگ» دەیڵێن. تەماشای لاپەڕە 2ی بەربانگی ژمارە 7 بکە کە لە ستۆکهۆڵم دەردەچێ.

بەڵام وشــە هــاوبەش و هاوشــێوەکانی کــوردی و فارســی، ئەوانەی سەرچاوەیان بۆ ئاڤێستا دەگەڕێتەوە، ئاڤێستاییەکان زیاتر لە کوردییەوە نێزیکن نەک فارسی، ئەوەش لە بەر دوو هـۆ کە کەمێ تیشکم خستە سەریان بەڵام دووپاتکردنەوەی بێ سوود نییە:

هـۆی یەکەم ئەوەیە بە بەڵـگە سـەپاوە کە زمـانی فارسـی لەگەڵ زمـانی ئاڤێستادا جیاوازە، بەڵام بۆ زمانی کوردی ئەوە نەسەپاوە.

هــۆی دووەم ئەوەیە پێغەمــبەری ئاڤێســتا کــورد بــووە و لە پێنــاوی بڵاوکردنەوەی پەیامەکەیدا، بۆ دەرەوەی هۆزەکەی خۆی کۆچی کردووە.

ئەگەر لە خراپتــرین حاڵــدا بســەپێندرێ کە زمــانی ئاڤێســتا لە زمــانی کــوردی جیـایە و زەردەشــتیش پیاوێــک یـا پەیـامبەرێکی نـاکورد بــووە، ئاڤێســتا هەر وەک کەلەپــوورێکی کــراوەی هەمــوو گەلە ئێرانییەکــان دەمێنێــتەوە و قامووسێکە هەر یەکە لەو گەلانە کـاتێ کەموکـوڕی وا لە خۆیدا دەبینێ پەیوەندییە کەلەپووریەکانی لاسەنگ بکا، بێ مـروەتییە بـۆ گەلێـک دەسبەرداری ئەو کەلەپـوورە دەوڵەمەنـدە بـێ و بـۆ خەڵکـانێکی لێگەڕێ کە بەرۆگری نین، یـا هەر بە هەوەس دەسبەرداری بەشـەکەی خۆی بێ.

فارسی، لە ڕێی دەسەڵاتی دەوڵەتی و ئاینییەوە دەسەڵاتی کوردی وێـران کرد و بۆ پارسە هەخامەنشیەکان گواستیەوە و تـا ئەنـدازەی زەوتکـردن

بۆ بەرژەوەندی خۆی دەستی بە سەر ئاڤێستادا گرت و بۆ هەخامەنشییەکانی گواستەوە و لە ئاڤێستاوە پلەوپایەیەکی وای لەدەسەڵات و خۆرێکخستن بۆ خۆی دابین کرد گەیاندیە ئەوەی بچێتە ڕیزی سەرووەت و کەرەسەی هرسکردنی خۆراکەوە چونکە فارسی تا ماوەی پتر لە دوو سەد ساڵ لە دوای ڕووخانی دەوڵەتی کوردە مادەکان و دەسەڵاتی هەخامەنشییەکان بەرۆگری دەسەڵات و ئاین بوو و هەرچییەکی لە بارەی ئاین و دنیا لە ئاڤێستادا هەبوو بە گوێرەی بەرژەوەندی خۆی گواستیەوە و لەگەڵ فارسی «پارسی» لەو ماوەیەدا، وەک عارەبی و قورئان یەکسان بوون و هیچ شا و میر و وەزیرێک یا سەرکردە و پارێزگارێکی ناو دەسەڵات و هیچ موبەد و هیربد و زوت و ئەتریات و کەسی تر لە پیاوانی ئاین نەبوو فارسی سەر بە دەسەڵاتی شاهانشا نەبێ و هەرچییەکی دەنووسی یا دەیگوت یا دەیخویند یا بە وانە دەیگوتەوە یا جاڕی بۆ دەدا، هەمووی، پیاو و گوتە و ڕێوڕەسم، ملکی فارسی کۆن بوون. تەنانەت دوای ئەوەی نەگبەتییەکەی ئەسکەندەر ڕووی لە هەخامەنشیەکان کرد و خاوبوونەوەی شارستانەتی پارسی لە سەردەمی دەسەڵاتی سلوکیدا لێکەوتەوە و هەرچییەکی لە دەسەڵات و ئاینی کۆن مابۆوە بە شێوازی پارسی داڕێژران و بە شانازی پارسی دەژمێردران. ئەوجا نۆرەی پەهلەوی هات کە زمانی دەسەڵاتی ئەشکانییەکان بوو و تێکەڵەیەکی پارتی «زمانی خوراسان، وڵاتی ئەشکانیەکان» و ئاڤێستەیی پارسی «هەخامەنشی» بوو و دەفرێ بوو بۆ کەلەپووری ئێرانی و ماوەی چوار سەدە ڕۆڵی گواستنەوەی دیت تا لە چارەکی یەکەمی سەدەی سێیەمی زایندا گەیاندیە دەست فارسە ساسانیەکان و ماوەی چوار سەدەی پێش هاتنی ئیسلام، فارسی ناوەنجی بووە بەرۆگری هەموو شارستانەتی ئێران.

ئەگەر لە سەر گێڕانەوەی ڕووخانی دەسەڵاتی ساسانی بوەستین یا تا ئەو دەمەی، دوو سەدە دوای فەتحی ئیسلامی، کە فارسی هێزی بە بەردا هاتەوە بە دوایدا بچین، ئەنجام هەر یەکێکە چونکە ڕەگەزی فارسی بە خۆ و بە زمانە فارسییە نوێیەکەیەوە وەک نوێنەری شارستانەتی ئێران بە بەرۆگریی ئەو شارستانەتییە مایەوە و زمانی کوردیش تا دوای هەزار ساڵی بێ خاوەنی، لە ڕووی سیاسی و شارستانەتی و ئابوورییەوە نەیتوانی ململانێی زمانی فارسی لە سەر میراتێکی ونبوو بکا کە چرنۆکی دەسەڵاتداری تێدا چێندرابوو. وەک چۆن کورد لە گۆشەی لەبیرچوونەوەدا مایەوە، «کوردی» ش وەکی خۆی، لە پەناوپەسێوی پشتگوێخستندا مایەوە. لە ڕووی زمان و شارستانەتییەوە، بە هیچ جۆرێ مەترسی لەوەدا نییە وەک دەبیستین هەندێ لە میرە کوردەکان دوای لەناوچوونی دەسەڵاتی ساسانی هەستی حەسانەوەیان کردووە و وەها بووە کە بەپیرەوەچوونی کورد بۆ ئیسلام و باوڕ پێهێنانی ڕاستگۆیانە بێ و لە پێناویدا قۆڵی هەڵماڵیبێ و ئیسلام لەو باوەڕە دووری بخاتەوە کە لە ڕێوڕەسمە ئاینیەکاندا ئەوانەی دەگوتەوە کە سەرچاوەیان لە ئاڤێستاوە بوو و بە ڕەفتار و گوتنیش خواپەرستی زەردەشتییان لە بیر کردبوو و دووریش نییە بە هۆی دابڕانی دوانزە سەدەوە، مێژووی خۆشی لە بیر چووبێ و بە هۆی نەبوونی شوێنەواری نووسراوەوە کە بەر چاوی کورد کەوتبێ پێ دەچێ نەخوێندەواری هەموو کون و کەلەبەرێکی لە کورد گرتبێ چونکە پەیوەندی بەو ئەرکە ئاینی و دنیاییانەوە نەبووە کە لە بارەی بە نووسین و ڕۆشنبیرییەوە بووبێ و هیچ جێی گومان نییە کە یادی مادەکان ماوەی دوانزە سەدە لە بیرەوەری کورددا ماوەتەوە و لە سەر زاران، لە نەوەیەکەوە بۆ یەکێکی دی گوازراوەتەوە لە کاتێکدا لە مێژووی دانپێدانراوی سەردەمی ساسانییەکاندا کە پڕە لە داستان، تەنها

ناوی شای فارسەکان و ئەشکانییەکان لە سەر هێڵێک هاتووە کە بەردەوام لە بەرزبوونەوەدابووە تا گەیشتۆتە هەخامەنشیەکان و موبەد و هربدە گەورەکانی وەک: تن سر و ئازدەمیهراسندان و هی دی. هەرچۆنێ بێ، کورد لە هەر کارێکدا کە پەیوەندی بە دەسەڵات و ئاین و مێژووەوە هەبووبێ حسێبی بۆ نەکراوە و وەک داروودەستەی شایەکان نەبێ قەت ئاوڕی لێ نەدراوەتەوە. ڕەنگە جاروبارێک و لە هەندێ باری نائارامی و لاسەنگبوونی دەسەڵاتدا کە دوای ئەوەی فارسی توانای خۆی بە دەست هێنایەوە ڕووی دابێ، مەودای نەفەسکێشان بۆ کورد بە شێوەیەک لە شێوەکان ڕەخسابێ، هەرچەندە لە هەمان کاتدا، بە هۆی نەبوونی ئاسایشەوە گەلێ پەتپەتێ و ناخۆشیشی بە سەردا هاتبێ، چونکە پێوانەکاری لە چارەنووسی نەتەوەییدا بە شێوەیەکی گشتی بەردەوامی و مانەوەیە بەرانبەر کەرەسەی قرتاندن و دابڕین و هرسکردن، کە لە کاتی ئارامی و بەهێزیی دەسەڵاتدا بۆ ئەو بەهێزە بەرانبەر بە لاواز دەڕەخسێن، کاتێ چ کێشەی نەبێ و هەر کاتێ ویستی ئەو سەرە بهەنجێنێ کە بۆ سەرفرازی ئاوڕ دەداتەوە دەیهەنجێنێ و کەسیش دەست نەخاتە پێش دەستی.

باسی ئەو لایەنانە جێ دەهێڵم کە بۆ مانەوە یارمەتی کوردیان داوە، وەک گەلێکی خاوەن سیما و تایبەتمەندی و زمانی خۆی کە ماوەی 25 سەدە خۆی گیڤ کردۆتەوە و تووڕە بووە و خۆشترین کاتی خۆی لەو کاتانەدا دیوە کە بشێوی و نائارامی هەبووە و چنگی دەسەڵاتداری بێگانە لە ناقرگەی شل بووە و ئەوەش لە پێشکەشکردنی واقعی زمانەکەیدا، لە گۆشەنیگای بەرچاوڕوونییەوە لەم گوتارەدا یارمەتیمان نادا. ئەگەر سەرنجی زمانی کوردی بدەین کە پێناسە و دەفتەرنفووس و جنسییەتی و وەک پێست، گۆشت و ئێسکەکانی داپۆشیوە و دەیپارێزێ، سەرمان

لەوە سورِ دەمێنێ کە چۆن وەک زمانێک بە زندوویی ماوەتەوە و توانای گەشەکردنی هەیە و کەرەسەی تەواوی دربڕینی هەیە و توێشەبەرەی قامووس و ڕێزمان و پەیوەندی وای تێدان کە بۆ پەرەسەندن لە ڕووی ڕۆشنبیریی سەردەم ئاواڵە بێ تا ئەوەی بەوپەڕی بێ لایەنییەوە، لە هەندێ جێی نووسینە کوردیەکانمەوە بۆ عارەبی تاقیم کردۆتەوە و لە وەرگێڕانی ئەو دەربڕینانەی کە لە منداڵدانی مێژووەوە پێوەی لکاوە، نارەحەتی زۆرم هاتنە پێش و هانام بۆ لێکدانەوەی واتاکانیان برد و سەرلەنوێ دامرشتنەوە. ئەوە خەسڵەتی ئەو زمانانەیە کە توانا و ڕەسەنایەتییان تێدا بەهێزن. ئێستا کە گەیشتووینەتە سەردەمانێک ئەو مژدەیەی پێیە کە گەلانی تێدا لەناو ناچن و هیممەتی نەتەوەکان ڕێ نادا تەنانەت جۆری گیاندارەکانیش بفەوتێن. ئەگەر ڕێکەوتی باش و بەختی یار ئەوە بێ کە هەندێکمان ماوەی نێزیکەی دوو هەزار و چوارسەد ساڵ لەگەڵ برا عارەبەکانماندا ژیاوین و ئەگەر هەموو ئەو ماوەیە بە خێریش تێپەڕ نەبووبێ تێکەڵێکی خێر و شەڕ بووە و خێری لەو شەڕەی پتر بووە کە هیچ میللەتێک نییە خۆبەخۆش ژیابێ، دووچاری نەبووبێ. مافی خۆمان بە سەر خۆمانەوە هەیە و مافی عارەبیشمان بە سەرەوەیە تا ئامێزی برایەتی کورد و عارەب بقۆزینەوە و ئێمەی قەڵەمبەدەست بەو ئەرکە مێژوویيە هەستین کە لە ئەستۆماندایە تا بەشە زەوتکراوەکانمان وەرگرینەوە و دوای ڕۆشنایی ڕۆشنبیری سەردەم، میراتی شارستانیمان وەرگرینەوە.

ئەو سەردەمانەی کە بە پشتشکاندن تێپەڕین و بە کەرامەت و بوون و زمان و زەمینی خۆمان نرخمان دا، مافمان دەدەنێ و هەست بەو ئەرکە دەکەین ئاڤێستا بکەینە بەڵگەنامە و «تاپۆی کوردی» و خاوەنداریتی خۆمان بۆ هەر وشەیەکی کە لە ئاڤێستادا هەیە و فارسی زەوتی کردووە

و له دادگای مێژوودا دەستی بە سەردا گرتووە، بسەلمێنین. ئێمە خاوەنی ئەو زمانەین کە قسەی پێ دەکەین و دەسبەرداری ئەو وشانە نابین کە هاوشێوە و هاوواتایان لە فارسیدا هەیە چونکە ئەو لێکچوون و هاوشێوەییە تەنها لە زمانە ئێرانیەکاندا نییە بەڵکو لە نێوان زمانە ئێرانیەکان و سانسکریتی و ئەوان و زمانەکانی ئەورووپاشدا هەیە کە لە سەرچاوەی هندوئەورووپی کەوتوونەتەوە. ئەو بنەمایە قەبووڵە داوا لە داگیرکەر و زەوتکەر بکرێ دەست لە داگیرکراو هەڵگرێ و بیداتەوە خاوەنی خۆی نەک لایەنی تاڵانکراو ناچار بکا دەسبەرداری ئەوەش بێ کە لە لای ماوەتەوە و دەستی لە بنی هەمانەوە پێ دەربکرێ. ئایە کەس لەو جیهانەدا هەیە عارەبی داگیرکراو ناچار بکا دەست لەو وشانە هەڵگرێ کە هاوشێوەیان لە زمانی داگیرکەردا هەیە، ئەوەش بۆ ڕەواندنەوەی تۆمەت و ڕازیبوون بە داگیرکاری؟ ئێمە خاوەنی زمانی خۆمانین و هەرچیەکی لە ئاڤێستا و ئاینی زەردەشتدا هەیە پەیوەندییان لەگەڵ زمانی ئێمە نێزیکترە و لە ویژدانی پیاوێکی کوردەوە هەڵقوڵاوە و ئەو ناڕازیبوونەی کە لاملێک دەریدەبڕێ گوایە خۆبەستنەوە بە زەخیرەیەک کە یەکلایی نەبۆتەوە، کارێکە ڕەت کراوەتەوە، چونکە ڕازیبوون بەوە ڕاگەیاندنی خۆبەدەستەوەدانە و هیچ زمانێک نییە ئێستای یەکلایی کرابێتەوە، لە کۆنەوە یەکلایی بووبێتەوە و عارەب و کورد و ترک و عەجەم لەم لایەنەوە یەکسانن. نەتەوەی کورد ڕەگداکوتاوی ناو ئیسلامە و باوەڕی ڕاستی هەیە و بە دڵسۆزی خزمەتی قورئان و زانستە عارەبیەکانی کردووە و کەس لەو لایەنەوە پێشی نەکەوتۆتەوە، تا ئەو ئەندازەیەی خۆی بیرچۆتەوە و وەک نەتەوەکانی دی دوای چاوکردنەوە و فرەوانبوونی هیواکانی پێی خۆشە زمانەکەی خۆی بە زادی مێژوویی خۆی دەوڵەمەند بکا و بەشی خۆی لێ وەرگرێ، نەک بە

زیادەوە، بەڵکو هەندێ بە کەمیشەوە. قەیدی ناکا. وەرگرتنەوەی میرات لە بارودۆخی کورددا وەک وەرگرتنەوەی شوێنەوارە مێژووییەکانە چا پەیکەر بن یا هەیکەل یا نەخش بن و مەبەستیش پەرستن نییە بەڵکو ڕازاندنەوەی خانەی شوێنەوار و کردنیەتی بە بەڵگەی دەوڵەمەندیی مێژوویی. کەس بیری لەوە نەکردۆتەوە گای باڵدار بەو بیانووە تێکبشکێنێ گوایە شوێنەواری بتپەرستییە و کەس لە ترسی گەڕانەوە بەرەو بتپەرستی و خراپەکاری خۆی لە ناوی لات و عوزە و مەنات و شەیتان لانەداوە. ئەو شوێنەوارانەی کە لە فالگری و ئەستێرەزانی ماونەتەوە نەبوونەتە هۆی قۆڵهەڵماڵین بۆ لەناوبردنیان. تەنانەت شیعری ڕووتیش کە دەکرێ دەستبەرداریان بن، هەروەها قسە لە بارەی لەشفرۆشییەوە لە کتێباندا بە ئەمانەت پارێزراون چونکە زەخیرەی داهێنانن و جوان داڕێژراوون نەک بۆ دووبارەبوونەوەی فەسادی. عارەبایەتی مافی خۆیەتی شانازی بەو زمانە پێشکەوتووەوە بکا کە خەڵکی سەردەمی «جاهیلی» قسەیان پێ کردووە و شیعریان پێ نووسیوە و قەشە و ڕەبەن بە شێوەیەک پەخشان و شیعریان گوتووە کە لەگەڵ سەردەمەکەدا نەگونجاوە. داوای مەحاڵ لە عارەبایەتی ناکرێ جاهیلی ناچار بکا بە جۆرێ شیعر و پەخشان بنووسن ئەبو زەڕی غیفاری لێیان ڕازی بێ لە کاتێکدا سەد ساڵ دوای جاهیلی بووە. ئارامی و سریانی ماوەی چەندین سەدە خزمەتی دەرباری فارسی و ئەشکانی و ڕۆمانییان کردووە و زۆر لە نووسەرانی شایەکان ئارامی بوون و بە هۆی مانەوەی زۆری ئەوانەوە لە خزمەتدا، وشەی ئارامی چوونە ناو نووسینی پەهلەوییەوە و بە شێوازی پەهلەوی دەخوێندرانەوە. ئەوەش بووە هۆی دروستبوونی زمانێکی سەیر و ناوی «هوزڤارش»[1]ی لێ نرا کە لە هەزار

---

1. پێ دەچێ ئەو زمانە لە شێوەی لینگوا ـ فرانکا بووبێ کە زمانی کەشتیەوان و جامباز و

وشه زیاتری لەخۆ دەگرت. وشەی تری ئارامی هەبوون شێوازی خۆیان پاراستبوو بەڵام نیشانەی پەهلەوی لە ڕێزماندا خرانە سەریان. ئەوەی ڕووی دا و بۆی هەبێ لەوەش زیاتر ڕوو بدا و کەسیش ئارامییەکان تۆمەتبار ناکا و گومان ناخاتە سەر زمانی ئارامی و داوا ناکا ئەو وشانە لابەرن کە بوونە کەر بۆ ڕابواردنی شایەکان. عارەبی بەهێز و دەوڵەمەند ڕێگر نەبوو لەوەی وشەی ئارامی تێدا بن چونکە زمانێکی سامی بوو و لە دوورگەی عارەبییەوە هاتبوو. میللەتان بەو موسیبەتانەیان لەگەڵدا ناکرێ کە هاڕیونی و دوایی، دوای هاڕین لە سەر ناپاکژی سزای نادەن و بە ئیفلاس پێکردن پاک ناکرێتەوە. زمانی کوردیش کە داوای مافی مێژوویی و میراتی خۆی دەکا، لە ڕووی هەستکردنەوە بە بوونی خۆی و بە ئاشکراکردن و ڕاپەڕین دژی داگیرکردن نەک پاڕانەوە و دەرۆزەکردن و سووکایەتی یا ورووژاندنی گومان. من ئەمە دەڵێم و کوردێکیش نەبووە هەوڵی دابێ بە زمانە کۆنەکەی پینەوپەڕۆی کردبێ یا لە نووسیندا بە «باز» و «بەرسەم» خۆی هەڵنابێ و نەمبیستووە کوردێک شتێکی گوتبێ و لە ئاڤێستای سویبێ وەک شاعیرێک بەرانبەر ناوی «زەمزەم» پێش هەزار ساڵ گوتوویەتی:

فارسەکان لە سەر زەمزەم زەمزەمیان کرد
ئەوەش لە باوباپیرانی هەرە کۆنیانەوەیە

ئەوە ئاماژەیە بۆ «سابور» لە حەجە درۆکەیدا کە بە پێی ئەو باوەڕەی کە لە سەری ڕاهاتبوو «زەمزەمە»ی کردووە. (ل393 مزدیسنا و ادبی پارسی ـ قسەکەی لە یاقوت و مەسعودییەوە وەرگرتووە).

---

بازرگانەکانی وڵاتانی دەوروبەری دەریای سپی ناوەڕاست بوو و وڵاتە عارەبییەکان بە ئیسپانییان دەزانی و فەرەنسییەکان بە عارەبییان دەزانی و تێکەڵەیەک بوو لە وشەی عارەبی و ئیسپانی و فەرەنسی. ح.ک

بەڵام ڕۆشنبیری سەردەمانەی کوردی لە سەرەتای ڕێگادایە لە بواری بەستنەوەی نوێیەوە بە کۆنیەوە و پڕکردنەوەی بەشە بۆشە لێکدوورەکانی مەودای مێژوویی و پانتایی فرەوانیان. هەتا ئێستاش مێژوویەکی پەسەندکراوی کوردی نییە قوتابی کورد بیخوێنێ و لە هەموو جیهاندا، ئەوەندەی من ئاگادار بم، ڕێکخراوێک نییە تەکلیف کرابێ یەک دڵۆپە ئاو بڕژێنێتە سەر یەک دانە تۆوی هەموو ڕۆشنبیریی کوردی کە خەریکە هەموو نیشانەکانی ڕێگای نێوان کۆن و نوێی بزر دەبن. خۆ ئەگەر کوردێک ڕووبەڕووی ئەم کارە ببێتەوە کە لە بەر مەزنییەکەی سامی لێ دەکرێ جگە لەوەی مەترسیدارە و بە کێشە و سەرهێشەی وایە هیممەت دەبا، لەم هەموو جیهانەدا یەک دەست نابینێ تەڵە قامیشێکی بۆ هەوادا تا لەو زەریا هارە دەربازی بکا کە سێ هەزار ساڵی نەبوونی و پەردە و تەمی بە سەردا دراوە، کە نیازی وایە لێی بپەڕێتەوە و بگاتە کەناری ئاسوودەیی. لە ڕووی نارەحەتی پەڕینەوەوە بۆ کەنار لە تاقیکردنەوەی خۆم ئەمەت بۆ دەگێڕمەوە:

یەکێ لە ڕێوڕەسمەکانی ڕێزی ئاگر لای زەردەشتییەکان ئەوەیە نزاخوێن چڵەدارێکی «بەرسەم»ی بە دەستەوە بێ (تا ئێستا زاناکان پێناسەی ئەو درەختەیان نەزانیوە، پێم وایە من لە نووسینێکدا ناساندوومە)... پانایی هەر چڵێکی، دەبێ هێندەی دەنکە جۆیەک بێ. ئەم دەنکە جۆیەش ناوی لە ئاڤێستا هاتووە «yava یەڤە» و وشەکە بە پێی یاساکانی دەنگگۆڕین گۆڕاوە و بووە بە «جەو» لە فارسیدا و «جۆ» لە کوردیدا و وشەی «یەڤە» لە بنەڕەتدا هەموو دانەوێڵەیەک دەگەیەنێ نەک جۆ بە تەنها. لەم بابەتە شاراوەیە زەینم بۆ وشەیەکی تێکەڵی کوردی چوو ئەویش «دانەوێڵە»یە. یەکەم بەشی دانەی دانە و بەشی دووەمی کەرەسەی بچووککردنەوەیە. مایەوە بەشی ناوەڕاست «وێ»

که هەمـــان «yava یەڤە»یە و کەوتـــۆتە ژێـــر کـــاریگەری دەنگـــی ناوچەکانی کورد و «ڤ»یان تێدا دەبێتە «و» و وەک چۆن یـونس دەبێتە وینس و یۆنان دەبێتە وێنان، ئەویش پێش «ی» دەکەوێتەوە. لە بری «یۆڵە» گوتوویانە «وێ لە ـ وێڵە» و ناوەکەش ئاوهای لێ هاتووە: دانەیۆڵە بۆتە دانەوێڵە.

ئەوەی کە پێویســـتە لێـــرەدا ڕوون بکـــرێتەوە ڕێـــزی ئـــاگرە لای زەردەشتییەکان کە خـودی «نـوور»ە و دەشڵێم کە ڕێزگرتن پەرستن نیـــیە. گـــا و ئەســـپ و مەڕیـــش لە ئاڤێســـتادا ڕێزیـــان هەیە و تەنانەت «گوسپەندە» کە وەک ناو لە مەڕ نراوە واتای گیانداری پیرۆز دەدا و واژەی سپەنتە خۆی سپەنتمانی لێ کەوتۆتەوە کە بە زەدەشت دەگوترا. ئەوەشی بۆ زیاد دەکەم کە ئاڤێستا وشەی ئاتەشگەی تێدا نییە کە واتای خانەی ئاگر بدا چونکە ئەو وشەیە لە داهێنانی سەردەمەکانی دواترە. ڕەنگە زەوی پیرۆزییەکی زیاتری هەبووبێ و پیسکردنی یەکێ بووە لە تاوانە گەورەکان و کەفارەتەکەی پیاوی بە هیلاک دەبرد.

لە ماندووبوون لە هەڵکۆڵینی وشەدا، فەرموو ئەوەش یەکێکی تر

یەکـێ لە واتاکـانی وشـەی «var»ی ئاڤێسـتایی دەرهاویشـتنە. دوای ماوەیەکی زۆری ژانی بیرکردنەوە، سەرنجم بۆ «کردار ـ فیعل»ێکی کوردی چوو کە لە سێ بەش پێکهاتووە ئەویش «هەڵ ـ ئا ـ ورد»ەیە و «ن»ی سەرچاوەشـی بە دوودا دێ و لە شـیکردنەوەدا «د»ەکەی لادەکەوێ و جێیەکەی هەمیشـەیی نیـیە. بەشـە نەگـۆڕەکەی «وار»ە. بەڵام «هەڵ» پێشگرە، هەروەها «ئا» کەوتۆتە پێکهاتەی «کردار»ەوە (ل86 فرهنگ ایران باستان) «کردار»ەکە بە گشتی هەڵبـژاردن و

جیاکردنەوە دەدا و دەرکەوت ڕەگی «کردار» لە «وار»دا لە کرداری تێکەڵ «هەڵ ئاوردن»، var خۆیەتی کە لە ئاڤێستادا «ڤ» بۆتە «و» ئەوەش بە پێی دەنگگۆڕکێ لە زمانە ئێرانیەکاندا.

ئەو دوو وشەیە لەو دوو نموونەیەی سەرەوەدا بە واتا هاوتایەکانیان لەگەڵ واتایاندا لە ئاڤێستادا، وێنەیان لە فارسیدا نییە و تەنها ئەنجامی خزمایەتی نێوان ئاڤێستایی و کوردییە. بەڵام alvar یەکێ لە واتاکانی تریدا دەکاتە «سووڕانەوە، بزاوتن» و کوردی و فارسی لەوێدا و بەو واتایە پێکدەگەن، ئەوەش دوای ئەوەی «ف»ی فارسی لە سەرەتایدا بە پێی دەستوورێکی دەنگگۆڕین گۆڕاوە و بۆتە «گ» و ئەوجا «گەر».

لەگەڵ ئەوەشدا شێوازی وشەکە «var» لە کوردیدا ماوەتەوە و ئەگەر بکرێتە «وەر» نێزیکترە، کە لە زۆر بواری بەکارهێناندا واتای خولانەوە یا شتێکی وەک خولانەوە دەدا. ئەوەش ڕوونە کە «و» لە «ڤ»وە نێزیکە چونکە هەردووکیان پیتی لێون.

ئاڤێستا کە خاوەنی گەلێ دەرگای کراوەیە بە ڕووی زمانە ئاریەکاندا بە گشتی، دەستەخوشکی سانسکریتیشە و هەر ئەوەتا دایک یا دایانی فارسی کۆن و پەهلەوی نییە و بە ڕای ئێمە سەرچاوەی کوردیشە و هیچ زمانێکی ئاریایی یا شێوەزارێکی ئەو زمانانە نییە لە پەیوەندیی بە ئاڤێستاوە خاڵی بێ مەگەر کۆنیی و ماوەی دوور و درێژی لێکدابڕان ئەو پەیوەندیانەی شاردبێتەوە، ئەوەش ڕێی تێ ناچێ. مەودای فرەوانکردنی ئەو لایەنانە نییە چونکە هەر یەکەیان درێژایی و پانایی و قووڵایی و لقی تێکئاڵاو و لێکدابڕاوی خۆی هەیە و چار نییە دەبێ دەست لە هەندێکیان هەڵگرین تا لە کاتێکی لەباردا بگەینە کۆتایی بابەتەکە.

زمانی فارسی

ئەم زمانە. سێ پلەی تایبەتی هەیە و هەر یەکەیان خەسڵەتی زۆر و جیاوازی هەیە:

یەکەم پلەی، ناوی فارسی کۆنی لێ نراوە کە ناوێکە زانا پسپۆڕەکانی بواری بابەتە ئێرانیەکان بۆ ئاسانکردنی بابەت و ڕەچاوکردنی هەر یەکە لەو پلانە لە ڕووی ڕێزمان و دەستووری زمانەوە لە سەری پێکهاتوون و مەبەستیش لەو ناوچانە بووە کە دانیشتوانی، لە باشووری ڕۆژهەلاتی ئێراندا، بە فارسی قسەیان کردووە و لە ڕووی ئاسایشەوە حکوومەتی ناوچەییان هەبووە و سەر بە میدیەکان بوونە تا ئەو کاتەی کۆرشی کوڕی ئەرشام پێگەیشت و مادەکانی تێکشکاند و لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی پێش زاین ولاتەکەیانی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و دوای ئەوە خۆی بووە شاهانشا. پاشماوەی زمانی ئەو گەلەش لە کۆنەوارە ئێرانیەکاندا کە شایەکان بە جێیان هێشتوون، لە چوارسەد و شتێ وشە پێکهاتووە کە لە وشەکانی ئاڤێستاوە نێزیکن بەلام جیاوازیشیان ئەوەندە هەیە کە بە دوو زمانی سەربەخۆ دابندرێن. کۆنترین شتێ کە لەو زمانەوە بۆ زانا ئێرانناسەکان ماێتەوە دە دێڕی نووسراوە لە سەر پارچە زێڕێک کە بۆ سەردەمی «ئاریا رەمەن» دەگەڕێتەوە کە باپیری کۆرشی گەورە بووە و ساڵی 610 ی پ ز حوکمەکەی دەستی پێ کرد.

ئەوەی لە شوێنەواری ئەرشامی باوکییەوە «باوکی کۆرش» مایەوە چوارده دێڕ بوو کە ئەوەش لە سەر پارچەیەک زێڕ نووسرابوو. شایەکانی دی شوێنەواری جیاوازی وشەیان لە دوای خۆیانەوە جێهێشت کە زۆربەی هی داریوشی گەورە بوو کە برازای کۆرش بوو و لە 510ی

پ ز تا 485ی پ ز دەسەڵاتی هەبوو و کۆتایی ئەو ماوەیەش بەوە هات کە ئەسکەندەر ساڵی 331ی پ ز دەستی بە سەر چەقی دەسەڵاتدا گرت و ئەوجا پلەی دووەم دەستی پێ کرد کە سیمای کەمێ نائاشکرایە چونکە دەسەڵاتی سلوکی هات و گەشەکردنی فارسی کۆنی ڕاگرت و کاری بۆ بڵاوکردنەوەی فەرهەنگی هیلینی (گریکی) کرد.

لە ناوەڕاستی سەدەی سێیەمی پێش زایندا ئەشکانیەکان، دەسەڵاتدارانی پارتیەکان بە سەر سلوکییەکاندا سەرکەوتن و پەهلەوی (بەدگۆڕانێکە لە پەرتەوییەوە هاتووە) بووە زمانی فەرهەنگ و دەسەڵات لە ئێراندا. پەهلەوی، دوو شێوەزاری هەبوون، یەکێکیان باکووری کە زمانی دەسەڵات و دەربار بوو، دووەمیان باشووری ڕۆژاوایی هاوسای پارسی بوو و لە نووسینی باشووریەکاندا وشەی «پەهلەوانیک» هاتووە بۆ ئاماژەکردن بە پەهلەوی باشوور ئەوەش لە درێژەبێژییەکدا کە ئێرە جێی نییە و باسی دەرکەوتنی «مانی» دەکا کە 215ی پ ز لەدایک بووە و هەروەها ئایینە نوێیەکەی و ئەو زمانەی پێی نووسیوە... بەڵام فارسی ناوەنجی بە گەیشتنی ساسانیەکان بە دەسەڵات و نەمانی دەسەڵاتی ئەشکانیەکان، لە ساڵی 226 ی پ ز، دەستی پێ کرد. فارسی کۆن لەو دەمەدا، واتە زمانی سەردەمی هەخامەنشی، دوای ڕووخانی دەوڵەتەکەیان لە ساڵی 331 ی پ ز، لە نووسیندا نەمابوو و لە سەردەمی ساسانیەکاندا بە گۆڕانکارییەکی زۆرەوە دەرکەوت و لە ڕاستیدا، لە سەر شێوازە کۆنەکەی بە مردوو دادەندرێ و ئیدی ژیانی بە بەردا نەهاتەوە. «پارسیک» بەو فارسیە دەگوترێ کە لە سەردەمی ساسانیدا بەکار هێندراوە تا لە فارسی کۆن و فارسی تازە (کتێبی زبان فارسی بەشی دووەم) کە لە سەدەی چوارەمی کۆچییەوە دەست پێ دەکا، جیا بکرێتەوە.

نازانین ئەگەر دەسەڵاتی دەوڵەتی هەخامەنشی مابایە، فارسی کۆن بە چ شێوەیەک پەرەی دەسەند، بەڵام ڕێی تێ دەچێ بوونی حکوومەتێک کە زمانێک لەو زمانانە و هەرچی دارشتن و وشەی هەیە لە نووسینی کاروباری ڕەسمی و ئایینی و ئەدەبیدا بەکار بێنێ، خوازیاری بەردەوامبوونی دەبێ و پارێزگاری لە ڕستە و شێوازیشی دەکا. بەڵام دەوڵەتی هەخامەنشی لەناوچوو و زمانی فارسی کۆن تەنها بووە زمانی ئاخاوتن و ئەو خەسڵەتانەی تێدا نەبوون لە گۆڕانکاری گەورە بیپارێزن کە بە سەریدا هات و دوایی لەگەڵ داهاتوویدا بەراورد دەکرا. ئەگەرچی پێکهاتەکانی لە نووسیندا لەناوچوون و تا ئێستا لە شوێنەوارەکاندا دەرنەکەوتوون، زمانی پەهلەوی کە بووە زمانی ڕەسمی و ئەدەبی ڕەواجداری ناوەڕاستی سەدەی سێیەمی پ ز تا یەکەم چارەکی سەدەی سێیەمی زاینی و بە زمانی ناوەنجی ئێرانیەکانی ئەو ماوەیە دادەندرێ و بە فارسی کۆن دەچێ و پردێکە لە نێوان فارسی کۆن و نوێدا و دەشێ بکرێتە پێوانە بۆ ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە سەردەمی سلوکیەکاندا بە سەر فارسیدا هاتووە تا دەرکەوتنی یەکەم نووسینی پەهلەوی کە شوێنەوارناسان دەستیان کەوتووە، گوایە پەهلەوی بەردەوامی فارسی کۆنە لەگەڵ هەندێ چاوپۆشیدا. بەڵام ئێمە لێرە، لە ئاستی پەهلەویدا ناوەستین، بەڵکو ئەو مەودا کاتییە دەبڕین و دەگەینەوە سەرەتای ساسانیەکان تا بزانین چ گۆڕانکارییەک قەوماوە، بگرە زیاتر دەڕۆین تا دەگەینە فارسی تازە تا بە گوێرەی دووریی نێوان فارسی تازە و کۆن بڕوانین چونکە نیگامان لەو بەراوردکاریانەدا هەڵسەنگاندنی نێزیکایەتی و دووریی نێوان زمانی کوردی و زمانی ئاڤێستا و زانینی پەیوەندی نێوانیانە، ئەوەش بە گوێرەی بەراوردی مەودای مەزەندە تا دەگەینە ئەوەی چ گۆڕانێک لە نێوان فارسی کۆن و نوێدا ڕوویداوە، کە

یەک زمانن و پەیوەندی نووسین و ئایین لە نێوانیاندا بەردەوام بووە و چەندین پلە لەو پەیوەندییە چاوەڕوانکراوەی نێوان ئاڤێستا و زمانی کوردی بەهێزتر بووە، کە ماوەی دەیان سەدە شێوازی نووسینی نەبووە و دەوڵەتی نەبووە و پەیوەندی سەرپەرشتیکردنی بە ئایینی زەردەشتییەوە نەبووە و جگە لە نێزیکایەتییەکی بۆماوەیی لە ڕێی ئەوانەوە کە بە کوردی قسەیان کردووە لە سەردەمی میدیەکانەوە، هیچی تری نەبووە.

زۆر بەداخەوەم کە دەرخستنی ئاستی جیاوازیی نێوان فارسی کۆن و تازە لە ڕووی کەلەپوور و ڕێزمانەوە زۆر زەحمەتە چونکە بابەتەکە دەبێتە چەند بەشێکەوە و کەرەسەکانی ئاخاوتن، لە ناو و کردار و پیت و کەرەسەی وابەستەیی و هی دی پێکدێن و بە ئاسانی شوێنپێیان هەڵناگیرێ بۆ کەسانێ نەبێ کە شتێ لەو زمانە ئێرانیانە بزانن. ژماردنی شێوازەکانی ناو لە فارسیدا سوودی نییە تا بیانژمێرین و بڵێین حەوتن:

1. کائی 2. آئی 3. وابستگی 4. رائی 5. بائی 6. ئازی 7. ئەندری و لەگەڵیشیاندا شێوەی ناو دەگۆڕێ و چی دی لە فارسی نوێدا ئەوە نییە. چ سوودیش لەوەدا نییە دوای جێناو و فرمان و بارودۆخە جیاوازەکانیان بکەوین و بزانین لە فارسی نوێدا و لە بواری شیکردنەوە و لێکدانەوەوە چییان بە سەردا هاتووە و ئەم درێژە پێدانە بۆ کەسانێک سەرنجی ئەو زمانەی نەدابێ هەر سەرهێشەی بە دواوەیە. لەبەر ئەوە وام پێ چاک بوو بەوەندە واز بێنم کە ناو حاڵەتی تاک و جووت و کۆ و نێر و مێ و بێ لایەنی هەبووە و بونیە و کۆتایی لە شیکردنەوەدا بە گوێرەی جێیەکەی لە ڕستەدا دەگۆڕا و هەموو ئەوانەش لە سەر فارسی نوێ بەندە و جووت و ڕەگەزی بێ لایەن و جوداوازی ڕەگەز لە ڕووی زمانەوانی شیکردنەوەی ڕستەوە نەمان و وشەکانیش وەها گۆڕان ئەوەی زۆر لە سیمای کۆن و نوێیان ورد نەبێتەوە نایانناسێتەوە و لێرەدا

نموونەیەک لە سەر فارسی کۆن بۆ خوێنەر دەهێنمەوە و دوایی شێوەکەی لە فارسیدا دینمەوە تا بزانیٚ چ گۆڕانکارییەک، کە زەینی بۆ ناچیٚ، ڕووی داوە:

ئەمە ڕستەیەکی کۆنی هەخامەنشییە کە بۆ سەردەمی داریوش (521 و 485پ ز) دەگەڕێتەوە:

دارەیەوئوش. خایەشەی. وەزەرەک. خەشایەشە. خشایەنسیە نام. خشایەنیە دەهیو نام. ڤیشتاسپە یەهیا. بوسی. هخامەنشی ئاتی. داریەوئەش...

ئەمەشیان لە فارسی نوێدا: داریوش. شاه بزرگ. شاه شاهان. شاه کشورها. پسر گشتاسپ. هخامنشی. گوید. داریوش..

واتاکەشی: داریوش. شای گەورە. شای شایان. شای وڵاتان. کوڕی ڤیشتاسپ. داریوش دەڵیٚ..

لە ڕووی بەراوردکارییەوە دەڵێم وشەی «ئاتی» کۆن «گویەد»ی نوێیە.

دوای ئەو دەقە قرتاوە وشەی «خەشەم تیی» دیٚ کە لە دوو بەش پێکهاتووە، یەکەمیان «خەشەم»ە کە وێنەیەکی گۆڕاوی «خەشایەشی»یە کە چوار جار هاتووە و واتای «شا» دەگەیەنیٚ. دووەمیشیان «تیی»ە کە کەرەسەی گۆڕینی ناوە بۆ ناوی واتایی و واتای هەردوو بەشەکە دەبێتە «خاوەنداریتی شاهانە». ئەم پاشگرە بەرانبەر «تات»ی ئاڤێستاییە و وەک گوتم کەرەسەی ناوی واتاییە و لە کوردیدا پەرەی سەندووە و بۆتە «ایەتی، ئەتی، تی» و بزوێنی «ە» پێش ئەوەی دواییان دەکەوێتەوە. ئەوانە هەموویان ناوی واتان و وشەی گونجاو پێشیان دەکەویٚ و ئەگەر وشەکە «خەشم تیی» بیٚ لە کوردیدا دەبێتە «شایەتی» بەلام لە فارسی نوێدا

دەبێتە «شاهی»ئەوەش بە زیادکردنی «ی» لە کۆتایی وشەکەدا کە کورتکراوەی «یە»ی پەهلەوییە و فارسی لەوە زیاتری نییە کەرەسەی واتای ناو بێ. بەو شێوەیە پاشگری «تات»ی ئاڤێستایی لە فارسی کۆندا بـۆتە «تیـی» و لە کوردیـدا چالاکـانە و زرپوزنـدوو و بە شـێوازی هەمەجـۆر دەردەکەوێ و لە فارسـی نوێـدا مـردووە ئەگەرچـی کـورد نووسینی لە ئەزەلەوە نەبووە. تۆ بڵێی فارسەکان ئەگەر بزانن پاشگریان لە زمـانی ئـێمەدا مـاوەتەوە، داوای نەکەنەوە؟ بـۆچی نـا؟ دەرفەتـی ئەوە هەیە گومان لە وشەکانمان بکرێ!

ئەگەر خوێنەر بۆ وەرگێرانێکی نوێی دەقێکی کۆنی فارسی بگەڕێتەوە، دەبینێ خاوەنی کتێبی «تاریخ زبان فارسی» وشەی «شەهریار»ی لە جێی «خشتم تیی» بۆ ئامازەکردنی خاوەنداریتی داناوە و وا چاکتر بـوو «شـــاهی» دابنـــێ چـــونکە «شـــاە» وشـــەیەکی پەرەســـەندووی «خشایەشی»یە. بەڵام «شـهریار» لە «شـهر: واتـا شـار» و «یـار بە واتای خاوەن» دێ و هەموو واتاکە دەبێتە «خـاوەن شـار». شـاریش لە کۆنـدا «خشـترە» بـووە و بـۆ «شـهر»ی فارسـی و «شـار»ی کـوردی گۆڕاوە. وشەی «خشترەپاوەن»یش بە واتای پارێزگاری شار داتاشراوە و دوایـی بـۆتە «شـهربان» و لە کوردیـدا «شـارەبان»ە بە نـاو و واتـاوە دەگـوترێ و ئەگەر وشـــەیەکی قامووســـی بەکـار بهێنـدرێ دەبێـتە «شارەوان». «خشترە باون» لە یۆنانی کۆندا بۆتە «ساتراب» بە واتای دەسـەڵاتداری نـاوچە لە لای فارسـە کۆنەکـان. لە درێژەپێـدان داوای لێبوردن دەکەم و هیوام وایە سوودی بووبێ.

فارسی، بە فرەوانیـی دەسـەڵاتیەوە لە زۆر نـاوچەی ئاسـیا و بـۆ مـاوەی دوورودرێژ بووە بەرۆکری گەورەی ئاڤێستا و ئایینی زەردەشتی و توانی لە زۆر وڵاتدا ڕەگی قووڵتر داکوتێ تا بۆتە زمانی خەڵک و وڵات. لێرەدا

مەبەست لە زمان وشەکانی نییە چونکە لە کۆنەوە مولّکی هەموو گەلانی ئێران بوونە و ئەوەشی تێیدا ئاڤێستایی بوو ڕاست و دروست ئەوەیە کە کەلەپووری کورد یا کەلەپووری نێوان کورد و نەتەوەیەک بووە کە ئێستا شوێنەواری دیار نییە. بەڵکو مەبەست لە دارشتن و دەستوور و زانستی زمان و شیکردنەوەیەتی چونکە فارسی جێی زۆر زمانی تری گرتەوە کە مەرجی بوونیان نەما و هەندێ جار بزر دەبن و هەندێ جار شوێنەواریان لە فارسیدا دەردەکەوێ. فارسی بووە یەکێ لەو دوو زمانە ڕەسمییەی ئەفغانستان و ماوەی چەندین سەدە زمانی ئەدەب و دەرباری باکووری هندستانیش بوو و زمانی بەشێکی گرنگی تاجیکی و لایەنگرانیان بوو و هەتا ئێستاش وایە. فارسی لە سەردەمی ساسانیەکانەوە کەرەسەی پەهلەوی بوو و پەهلەویش لە سەردەمی ئەشکانیدا بەرۆگری فەرهەنگی هەموو ئێران بوو و ئەو زمانەش بوو کە ئاڤێستای پێ شەرح دەکرا و دەقی ئەدەبی پێ دەنووسرا و لە نووسینی ڕەسمیدا بەکار دەهێندرا. سەیر لەوەدایە کە «ڕەنگە زەرەر قازانج بێ» بە شێوەی خۆی و بە پێچەوانەشەوە دەرکەوت «ڕەنگە قازانج زەرەر بێ» ئەوەش لەو زمانانەدا کە دراوسێی فارسی بوون و پەیوەندییان پێوە هەبوو و لە هەر کوێیەکی حکوومەت و نووسین و ناوەندی شارستانەتی گەورەی ناوچەکان لەو سەردەمە کۆنانەدا بووبێ، فارسی جێی زمانی خەڵکەکەی گرتۆتەوە و «قازانجی زەرەربەخش» بووە. بەڵام کوردی لە دوای لەدەستدانی ناوەندی دەسەڵات «هەمەدان» بۆ هەخامەنشیەکان، بە هۆی دووریەوە لە ناوەندی دەسەڵاتەوە و نەبوونی نووسین و ناوەندی شارستانەتی گەورە لە داگیرکاری زمانی فارس دەرباز بوو و «زەرەرەکەی بە سوود بوو». تا ئێستا باس باسی زمانە نەک چارەنووس و مافی نەتەوایەتی، چونکە کورد لە پارێزگاریکردنی

زمانەکەیدا زۆری لە زەمین و خوێن و خۆشیەکانی ژیان و مەرجەکانی شارستانەتی لە دەست دا لە کاتێکدا تاجیکی خاوەنی لەزەت و خاک و کیانە، هەر وەها ئەفغانی و هندی باکوور. لەم گۆشەنیگایەوە کوردی شارەزای ڕووداوە مێژووییەکان زیاتر بە زمانەکەیەوە وابەستە دەبێ و بۆ فارسەکان دەسبەرداری هیچی نابێ. بۆ فارسەکان، دەستمان لە هەمەدان هەڵگرت کە چەقی دەسەڵاتی کورد بوو لە هەندێ لە سەدەی شەشەمی پێش زاین و چەند سەدەیەکی پێشتر. دەستمان لە ڕووبەری بەرینی تریش بەردا، تەنانەت ئەولیا چەلەبی کە پێش سێ سەدە بەر لە ئێستا هەندێ شوێنی لە وڵاتی کورد دیوە، ئێستا سەد کیلۆمەتر لە نێزیکترین خاکی کوردەوە دوورە. هەر وەها بە شایەدی هەندێ لە برا کوردەکانی ئێرانمان کە تا ڕووخانی محەمەد ڕەزا پەهلەوی لە عیراق پەنابەر بوون، دەستمان لێ بەردا و دەستمان لە دەسەڵات و خۆشی و حەسانەوە و ئاسوودەیی و هەموو شتێ بەردا و ئەم دارشتنە کوردییە نەبێ کە بە زارماندا دێ بە هیچ شتێک تۆڵەمان بۆ نەکراوەتەوە و بەو غایەلە و گومانانەی دەوریشی دەسبەرداری نابین.

گوتمان فارسی بووە بەرۆگری هەموو کەلەپوورە ئێرانییەکان ئەوەش بە گەیشتنی ساسانیەکان (226 پ ز). خوێنەر سەری لەوە سوڕ دەمێنێ کە کەلەپووری ئێرانی هەمووی بۆ فارسەکان، زمانی دەسەڵات گوازرایەوە بەڵام دوای ئەوەی لە هۆکارە مێژووییەکان ورد دەبینەوە، دەبێ هۆیەکەی بخەینە ڕوو. نموونەیەکی بەردەستمان لەو بوارەدا هەیە کە دوو کەس نییە لەسەری یەکڕا نەبن، ئەوەش ئەوەیە تورکە عوسمانییەکان دەسەڵاتیان لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامیەکاندا گرتە دەست و خۆیان بە پارێزەری ئیسلام دانا و خەلافەتیان کردە پشتاوپشت و داگیرکردنی ئیستەنبووڵی پایتەختی بیزەنتی مەسیحیش ناوەندی

دەسـەڵاتیانی بەهێزتـر کـرد و کردیـانە بەڵـگەی دروسـتیی ڕێبـاز و خەلافەتی خۆیان، لێرەدا باسی ئەوانە ناکەین. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، وەک ئاڤێستا گوازرایەوە لای فارسە ساسانیەکان، کەلەپووری ئیسلام و زانستی قورئان نەگوازرانەوە لای عوسمانیەکان. ئەوەش دوو هۆی هەیە و پێویست بە هۆی سێیەم ناکا: یەکەمیان ئەوەیە ئیسلام بە جلوبەرگی عـارەبییەوە نەتەوەی عـارەبی لە دواوە بـوو کە خـاوەنی قورئـان و پێغەمـبەری قورئـان بـوو و هەرگیـز بـۆ عوسـمانیەکان هەڵـنەکەوت نـوێنەرایەتی عـارەب بـکەن و عارەبـایەتی هـرس بـکەن و بـیخەنە کەلەپـوورە نەتەوەیـیە فشـوفۆڵەکەی خۆیـانەوە. ئەو نەهەنـگە زلە بە هونەری عارەب و زانستی ئیسلام گەورە بوو و هەموو ئەو ماسییانەی قووت دان کە لە ناو زەریای ئەو هونەر و زانستەدا بوون. زۆری نەمابوو پـێچەوانەی ئەوە بقەومـێ ئەوەش تـوانەوەی عوسـمانیەکان بـوو لە نـاو ئیسـلام و عارەبایەتیـدا. لێـرەدا قسـەیەکم بیـر دێتەوە کە بەر لە پەنجـا ساڵ خوێنـدوومەتەوە، قسـەکەش هـی مامۆسـتای نەمـر مسـتەفا سـادق ڕافعیی بوو لە بارەی ڕۆشنبیریی عـارەبییەوە لە ناو میللەتە موسوڵمانە ناعارەبەکاندا و دەڵێ ئەو وڵاتەی تەنها عارەب حوکمی بکا عارەبی بۆی دەبێتە کەرەسەی ڕۆشنبیری و باوەڕ، لە کاتێکدا، لە مێژووی کۆندا خێڵە جەرمانیەکـان شـاری ڕۆمایـان داگیـر کـرد کە پـایتەختی ئیمپراتۆریـای ڕۆمـانی بـوو، دەسـەڵاتیان گـرتە دەسـت بەڵام نەیـانتوانی زمـان و فەرهەنگیـان بە سـەردا بسەپێنن، بەڵکو بە پـێچەوانەوە، چـونکە زمـان و فەرهەنگەکەیان لە چاو ڕۆمانەوە لاواز بوو. قسەیەکی لەو بارەیەوە هەیە و لە زەینمـدا مـاوە: «لەرزی مێـژوو گرتبـوونی و لە نـاو ڕۆمانیـدا کەوتبـوون». خـۆ ئەگەر هێـزی بـاوەڕی ئیسـلاممان خسـتە سـەر کەلەپووری عارەب و زمانی عارەبی، قسـەی ئەو مامۆستا نەمرە دەبێتە

سەرەتایەکی باش بۆ ئەوەی باوەڕ بێنین ئەگەر تەمەنی عوسمانیەکان درێژتر بوایە تا ئەو دەمەی عارەب دەسەڵاتی کۆنی خۆیان بە دەست بهێنایەتەوە، مێژوو خۆی دووبارە دەکردەوە. شتێکی وەک توانەوەی جەرمانی لە ڕۆمانیدا، لە کاتی لاوازبوونی عارەبدا ڕووی نەدا و شتێکی لەو بابەتە، توانەوەی تورک و فارس لە عارەبدا، لە سەردەمی عەباسیەکاندا ڕووی دا ئەگەرچی بە سەریدا زاڵیش ببوون. دووریی سوڵتانی عوسمانی لە وڵاتێ عارەبانەوە جۆرە پارێزگارییەک بوو بۆ ئەوەی نەتوێتەوە و ئەوەش هاشا هەڵناگرێ.

هۆی دووەم ئەوەیە زمان و کەلەپووری نەتەوایەتی عوسمانییەکان لە بناغە و بنەما و سروشتەوە جیاوازی لەگەڵ کەلەپووری سامیدا بە گشتی و عارەبیدا بە تایبەتی هەبووە چونکە عارەبی زۆر بەهێز بوو و بۆ ترکی دراوسێی عارەب زەحمەت بوو ڕێڕەوی دوورودرێژی عارەبی بە ڕاستی بگرێ ئەوەش لە بەر ڕوونی عارەبی و شیکردنەوە و ڕەوانبێژی قورئان، هەندێ لەو تورکانەی کە لە ناو عارەبدا ژیان، توانەوە و سەرچاوەی خۆیان لەبیر کرد. جیاوازی کەلەپوور، لە دوو ڕووەوە کاریگەریی گردەبڕی هەبوو: لێنەگەڕا حوکمکراو لە ناو دەسەڵاتداردا بتوێتەوە و لێنەگەڕا دەسەڵاتدار لە ناو حوکمکراودا بتوێتەوە. ئەوەی بە سەر جەرمانیدا هات، بە سەر تورکدا نەهات.

بەڵام کەلەپووری ئێرانی کە سەرچاوەکەی ئاڤێستا و زمانەکەی بوو، پشتی چۆڵ بوو و کەس نەبوو بیپارێزێ و بیگرێتە خۆی. وەک گەلێکی بێ پەرژین هەرچی دەهات خۆی پێدا دەکرد. هیچ سەیر نییە فارسی دەستی بە سەر کەلەپووری هەموو ئێراندا گرتبێ، لە دەسەڵاتی ئەخمینییەوە تا دەگاتە ئەو دەمەی ئەسکەندەر بە سەریاندا زاڵ بوو و دوای ڕووخانی ماد و گەیشتنی ئەوان بە دەسەڵات، کەس نەبوو بۆ

خـۆی پارێزگـاری لە ئاڤێسـتا بکـا. ئەوەش سـەیر نیـیە پەهـلەوی، دوای شکسـتی سـلوکیەکان بەرانـبەر ئەشـکانیەکان کە خـاوەنی پەهـلەوی و بەرۆگری ئاڤێستا بوون دەستی بە سەر کەلەپووری ئێراندا گرت و جگە لە ئەشکانیەکان کەس لە ئارادا نەبوو. دوای ئەوەی فارسـە ساسانیەکان ئەشـکانیەکانیان ڕووخانـد، ئەوەش سـەیر نییە فارسـی دەسـتی بە سـەر کەلەپـووری هەمـوو ئێرانـدا گرتبـێ چـونکە کەس نەبـوو ململانێـی دەسەڵاتیان لەگەڵدا بکا. دوای هاتنی ئیسلام، جارێکی دی هەر لە سـەر کەلاوەی ساسـانیەکان، کەلەپـووری ئێـران هەر بە تەشـیی فارسـی ڕێسـرایەوە و هـۆیەکەش وەک خـۆر ئاشـکرایە، ئەوەش ئەوەیە هـیچ میللەتێکـی ئێرانـی جـگە لە فارسی و پەهلەوی دەستەخوشکی، خـاوەنی ڕۆشنبیری و نووسین نەبوو تـا بەرەنگاری فارسـی ببێتەوە. پەهلەوی بـۆ خۆشـی لە سـەردەمی بڵاوبـوونەوەی ئیسـلامدا 400 سـاڵ بـوو سـەر بە فارسی بوو و بە هیچ چەقێکی دەسـەڵاتی دەوروبەر پشتئەستوور نەبـوو، بەڵکو لە ڕووبەرێکی بەرفرەواندا، کە هەمووی لە ژێر دەسەڵاتی فارسیدا وەک زمـانی دووەمـی دەسـەڵات بـێ خـاوەن بـوو. ڕێـی تـێ نەدەچـوو لە پاشماوەی ئێرانـدا شـان لە شـانی فارسـی بـدا. خوراسانیش کە بێشـکەی ڕەسەنی پەهلەوی بوو، ببووە ستانێکی فارسی، و پەهلەویش چ هیوایەکی نەمابوو. ڕەنگە گەلی کورد و لەگەڵیشـیدا بلـوج کە لە ڕۆژاوای ئێـرانەوە چووبـــوونە ڕۆژهەڵات و باشـــووری ڕۆژهەڵات (ئەمە نێزیکـــایەتی لە کـــوردییەوە ڕوون دەکـــاتەوە)، ئەوجـــا هەنـــدێ کەرت و پـــارچەی پەرشـوبڵاوی زمـانی تـر لێـرە و لەوێ مـابوونەوە کە لە تـووانەوە لە نـاو فارسـیدا دەربـاز ببـوون. سـەیریش نیـیە زۆربەی زۆری مێژوونووسـانی عـارەب و ناعـارەبی سـەردەمە جیاوازەکـانی ئیسـلام هەمـوو ئێـران بە فارسی دابنێن و ناوهێنانی کورد ماوەیەک دوای هاتنی ئیسلام کەوتەوە،

ئەوەش ئەو دەمەی کە تەمـــی فارســـی ساســـانی لە ســـەر نـــاوچە نافارسەکانی دەسەڵاتی ئیمپراتۆری ئێران ڕەوییەوە. ئەوەش سەیر نییە دواتـر تـورک ببینین بەرەو ئەدەبی فارسـی دایبشکێنن تا ئەو ئاستەی ئەدیبێکـی تـورک نـابینین لە سـەردەمی عوسـمانیدا دەسـتی لە ئەدەبـی فارسـیدا نەبـووبێ یـا بە لای کەمەوە ئاگـاداری نەبـووبێ لە کاتێکـدا بە دەگـمەن فـارس هەبـوو بەرەو ئەدەبـی تـورکی دایشـکاندبێ هەرچەنـدە تەرازووی هێزی عوسمانیەکانیش قورستر بـوو، ئەوەش لە بەر ئەوە بـوو ئەدەبی نـوێی فارسی ڕەگـی قـووڵ بـوو و تەمەنێکـی درێـژی نێـزیکەی چوارده سەدەی لە پشتەوە بوو ئەوجا تورک پێی ئاشـنا بـوون. هەروەها لە سـای کەلەپووری ئیسـلامی عارەبیـدا پتـر گەشـەی کردبـوو و پەرەی سەندبوو، ئەوەش بە پێی قسـەی هەنـدێ لە شارەزایانی مێـژوو کە لێم خوێنـدوونەتەوە. فارسـی تـازە ئەگەر بە کەلەپـووری فارسـی نـاوەنجی بپێـورێ، بەو کیـژە گونـدییە دەچـێ چـووبێتە پـاریس و بە دەسـتی «کەوافیر» و بادیکیر و مانیکیر ڕازێندرابێتەوە. خۆ ئەگەر هەرچـی هێـز و جوانی لە فارسی کۆندا هەیە کۆ بکرێتەوە ناگاتە دوو بەیتی شانامە یا «زمانی غەیب»ی حـافزی شـیرازی. لەوەدا مەودای بەراوردکاری نییە لە نێوان پەرەسەندنی سـەرەتای فارسی و ئەوەی لەو دوادواییەدا ڕووی دا، لەگەڵ عارەبیـدا کە دواتـر لە دوای ئیسـلامدا بـووە زمـانی ئەدەب و زانسـت. عـارەبی لە سـەردەمی جاهیلیشـدا، لە بـواری هێـز و جوانیـدا دەسـتەپاچە نەبـووە و شـاعیر و ئەدیبـان هەوڵیـان دەدا شانبەشـانی ڕەسـەنایەتی عـارەبی هەنگـاو بنـێن و بەرەو زمـانی پـاکژی بـادیە کە چ وشەی عەجەمی تێدا نەبووە، بگەڕێنەوە. قورئـانیش کە لە نێـوان ئێمە و جاهیلیـدا لەلەیە و لێمـانەوە نیـزیکە، تـا نووسـینی ئەم بـابەتە لە لـوتکەی ڕەوانی و ڕەوانبێژیدایە و هەر واش دەمێنێتەوە.

لەم بۆچـــوونەوە لە بـــارەی خەیـــاڵکردنەوە لە جـــوانی فارســـی تـــازە و بێگەردیی عارەبی بە کۆن و نوێیەوە، پێش دە ساڵ بە کوردی نووسیومە کە شاعیرەکانمان لە کوردستانی عیراق و ئێراندا، کاتێ بەر لە 160 ساڵ لە سەر سەکۆی فەرەزدەق و موتەنەبی و ئیبن فارز و سەعدی و حافز و نیـزامییەوە دەسـتیان کـرد بە نەزمـی کـوردی، بازێکیـان دا ئەگەر لە ئاسـتی سـفرەوە ئەو بازەیـان دابـا، نەدەگەیشـتنە ئەو جێـیەی کە پێـی گەیشتن. ئەوەشی کە نابێ لەم بوارەدا لە بیـری بکەیـن کە پێداویسـتی هێنـاویەتیە پـێش ئەوەیە کە هەرگیـز شـاعیر و نووسـەری عـارەب پێویستیان بەوە نەبووە پەنا بۆ هونەری کەشکەشە و نەمنەمەی شیعری فارسی بەرن، لەبەر ئەوەی زمانی خۆیان ئەوەنـدەی کەرەسە تێدا بـووە پەنا بۆ خواسـتنەوە نەبەن بەڵکو هەمـوو دەرچوونێـک لە پێوانەی هێـز و جوانیی لە لایان، لادان بـووە لە جـوانی و ڕەوانبێـژی. لێـرەدا جیاوازی لە نێوان دەسەڵاتداری هەژاری عوسـمانی و عـارەبی بندەستەی دەوڵەمەنـد لە بـــواری کەلەپـــووردا دەردەکەوێ، لەگەڵ جیـــاوازی هەڵوێســـتیاندا بەرانبەر کەلەپووری فارسی.

پێم وا نییە پێویست بە درێژەپێدان بکا چونکە ئەوەی گوترا بەشـی ئەوە دەکا بمانگەیەنێتە یەقین و هەولێش لەگەڵ ئەوانەدا کە نایـانەوێ بـاوەڕ بێنن، دەبێتە کوتانەوەی ئاسنی سارد، بەڵام لە سـەرمە شتێ زیاد بـکەم تا ئەو بڕوبیانووانە بڕەوێنمەوە کە ڕەنگە بێنە پێش. دەگوترێ فارسی لە لایەن قەڵەمبەدەســـتانی کـــوردەوە بەکـــار هێنـــدراوە، هەر لەوانەوە کە دەنگیـان پێمـان گەیشـتووە تـا ئەو میـرزایەی بە دەفـتەری دەسـتیەوە دەگەڕا و نـامەی بـۆ ئەم و ئەو بە فارسـی دەنووسـی، تـا دەگـاتە ئەو دەمەی کە بەتەمەنەکانمـــان لە بیریـــانە. ئەوە قســـەیەکی ڕاســـتە و هۆیەکەشـی لە یەک ئاڕاسـتە زیـاترە: هـۆی یەکەم ئەوەیە کە نەتەوەی

کورد هەرگیز نووسینی نەبووە و قوتابخانەشی نەبووە تا فێری نووسینی کوردی بکا و بیریشی لەوە نەکردۆتەوە بە کوردی بنووسێ، بەڵکو بە هۆی کڵۆڵییە ئەزەلییەکەیەوە بیری لەوە نەکردۆتەوە نەبوونی نووسینی کوردی کەمایەتییە... من خەڵکانێکم لە بیرن بە بیریاندا نەدەهات بە کوردی بنووسرێ یا بخوێندرێ و لەوەش زیاتر لە سەر بڕیاردانی زەلیلبـــوون دەڕۆم کە بە ســـەرماندا ســـەپاوە و قســـەیەک لە ســـەر سووککردنی زمانەکەی خۆیاندا دەگوازمەوە کە بە فارسی دەیانگوتەوە و نەفامانی کورد دەیانجووەوە: فارسی شەکرە و عارەبی زمانی پێغەمبەرە و تورکی فەزیلەیە و کوردی ڕەزیلەیە (وشەکە لە ڕەزیلە قورسترە بەڵام بە وشەیەکی سووکتر گۆڕیم) هیچ گومانم نییە کە یەکەم کەس ئەو شەکرانەی شکاندووە یەکێ بووە لەو کوردانەی هەستی زەلیلی و چرووکی گەیشتۆتە بنەبانی هەستی و خەریکە لۆمەی ئەو جۆرە کەسانە نەکەم. زانا و دانا، محەمەد ئیبن ئادەم پەراوێزێکی بۆ نامەیەکی خۆی لە بارەی چارەسەری ئیبن کەمالەوە و لە سەر شیکردنەوەی «لا تخشـــون» لە یەکێ لە مانگەکانی 1205دا نووسیوە و دەڵێ: سەیر لەوەدایە بیستوومە لە سەر دیباجە کوردیەکە قسەیان پێ گوتووم و بەوەش مەسەلە کوردییەکە لە سەریان دەسەپێ کە دەڵێ «وەک هێلکەیەکی لە توێکڵی خۆی دەرچووبێ». ئەوەی وەک شایەدییەک لە سەر کارەساتی خۆ بەکەم زانینی ئەوانە گوتووە شەرمەزارییان لەوەدا دیوە بە زمانی خۆیان بنووسن. بەڵام من لایەنگری لۆمەکردنیان نیم ئەوەش بە هۆی ئەو هەستە شاردراوەوە کە ماوەی بیستوسێ سەدە هەستیان بە جیاوازیی خۆیان کردووە تا ئەو ڕۆژەی ئیبن ئادەم پەراوێزەکەی نووسیوە. جگە لەوەش، ئەوانەی نامەیان دەنووسی و دەفتەر بە دەست بوون، لە شارێکدا ژمارەیان لە ژمارەی پەنجەی

دەست تێپەڕی نەدەکرد. ئەگەر بە کوردی بیانئوسیبا یا بە زمانی واقواق هیچ نەدەگۆڕا و کەس لەو سەردەمەدا بیری لەوە نەکردۆتەوە ئاخۆ ئەوانە چی دەنووسن و بە چ زمانێک دەنووسن. بەڵام زانا ئاینییەکان وانەی عارەبییان بە شەرحی کوردی دەگوتەوە و کەمیان هەبوو فارسییان زانیبێ چونکە لە بابەتی ڕۆشنبیرییانەوە دوور بوو. تەنانەت ئیبن ئادەمی زانا دەنووسێ و دەڵێ کە خۆی بۆ فێربوونی فارسی ئامادە کرد (بۆ تەواوکردنی کەرەسەی ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە) چووە هەندێ شوێنی ئێران و لەوێ نیشتەجێ بوو تا فێری بوو. دیارە لەو ناوچەیەدا کەسی دەست نەکەوتووە لەو ئاستەدا بێ فێری بکا بۆیە دەربەدەری پێ باشتر بووە. ئیبن ئادەم لەو بوارەدا بێ وێنەیە دەنا خەڵکی تر، ئەوەندەی پێی بزانین، ئەو هەوڵەیان نەداوە.

شاعیرەکانیش، لەوەتەی شیعری کوردی هەیە، بە کوردی نووسیویانە و کەمێکیان نەبێ کە بە فارسی و عارەبی و تورکی، لێرە و لەوێ نووسیویانە، ئەگەر هەموویان کۆ بکەینەوە سەنگێکی ئەوتۆیان بەرانبەر ئەو شیعرانە نابێ کە بە کوردی لە دیوانەکاندا نووسراوون.

ئەوەندەی پێی بزانین کۆنترین شیعری کوردی هی بابە تاهیری هەمەدانییە کە بە عوریان ناسراوە. خاوەنی «تاریخ زبان فارسی» لە لە لاپەڕە 38ی بەشی سێیەمدا، لە «معجم البلدان»ەوە ئەوە دەگوازێتەوە کە «نەوشیروان بەغدادی» ناوی شاعیرێکی کوردی سەدەی پێنجەمی هیجرییە و بە شیعرێکەوە ناوی دەرچووە و بە شەیتانی عیراق ناسراوە، بەڵام بەرچاوم نەکەوتووە. عەلی حەریری دەدرێتە پاڵ سەدەی یانزە و دوای ئەو فەقێی تەیران (1307 ـ 1375 ز) ئەوجا مەلای جەزیری (1408 ـ 1481ی ز) و دوای ئەویش ئەحمەدی خانی (1640 ـ 1706ی ز) و هی دی کە ناویان زۆر بڵاو نییە.

سەرچاوەکان ئەوەش دەگێڕنەوە کە کتێبێک بەر لە هەزار ساڵ، لە سەر دەرهێنانی ئاو بە کوردی هەبووە کە ئیبن وەحشیە دایناوە، ئەمەش کۆنترین نووسراوی کوردییە کە بەر گوێمان بکەوێ. ئەوجا هیچ لە بارەی پەخشانەوە نابیستین تا ساڵی 1000ی کۆچی کە عەلی ترماخی کتێبێک بە کوردی لە سەر زمانی عارەبی دادەنێ. لە پەخشاندا «عەقیدەنامەی کوردی» هەیە کە زیائەددین مەولانا خالیدی شارەزووری (1193 ـ 1242ی کۆچی، 1779 ـ 1828ز) دایناوە. شیعری بە عارەبی و فارسی هەیە و هەمووشی سۆفیگەرییە و هەندێکیشی لەو بارەیەوە بە کوردین. «ئیبن ئەلحاج»یش شیعری کوردی لە سەر باوەڕ هەیە و ناوی «مەهدینامە»یە و ساڵی 1176 کۆچی دایناوە.

شێخ مارفی نۆدی شیعری ئایینی بە عارەبی نووسیوە و زۆربەی پێداهەڵدانە. قامووسێکی عارەبی ـ کوردیشی بە شیعری کوردی نووسیوە ناوی ناوە «ئەحمەدی» ئەوەش بە ناوی «ئەحمەد»ی کوڕیەوە کە دواتر لە تەریقەتی قادریدا تاقانەی سەردەمی خۆی بوو و بە «کاک ئەحمەد» ناوی دەرچوو و لە هەندێ هۆسەی خەڵکی باشوور باس دەکرا و دەیانگوت «ثلثه لکاک احمد و اکراده ـ سێیەکی بۆ کاک ئەحمەد و کوردەکانی». شێخ مارفیش هاوسەردەمی مەولانا خالید بووە و لە هەردوو سەدەی دوانزە و سیانزەی کۆچیدا ژیاوە.

بەڵام شیعری کوردی کە بەو دواییانە لە دیواندا بڵاو بوونەوە، لە بواری سۆز و هەست و وەسف و شتی لەو بابەتانە بوو و دوایی شاعیرەکان لە کوردستانی عیراقدا و لە سەردەمی عەبدولڕەحمان پاشای باباندا کە ساڵی 1228ی کۆچی کۆچی دوایی کرد خزانە ناو کاروباری دنیاوە. هەر لە سەردەمی ئەودا نالی و سالم و مستەفا بەگی ساحێبقڕان کە نازناوی «کوردی» بوو و کەمێ لە دوای دووەکەی ترەوە بوو

دەرکەوتن، ئەوجا حاجی قادری کۆیی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی و زۆری تر پەیدا بوون. ئەوەم پێ سەیرە تا نەزمی کوردی بڵاو نەبووەوە، شاعیرانی وەهای کورد دەرنەکەوتن دیوانیان هەبێ و یەک دوو بەیت یا یەک دوو شیعر لە سەرجەمی ناوچەکەدا جێی هیچ ناگرێتەوە و لە هیچ زمانێکدا گۆڕانکاری ناکا. ئەوەش دەلالەتێکی قووڵ لەوە دەکا کە بەڕێوەبەرایەتی دەسەڵاتی شێخ مەحموود لە سلێمانی لە سەرەتای بیستەکاندا، لە یەکەم ڕۆژیەوە بە کوردی دەستی پێ کرد و ڕۆژنامەکەی و تەنانەت نامە تایبەتیەکانی شێخ مەحموود لەو سەردەمەدا و نامەی خەڵکی تریش بە گشتی بە کوردی دەنووسران و سمایل ئاغای شکاکیش کە نازناوی «سمکۆ»ی هەبوو لە ورمێ ـ دواتر ڕەزاییە و دیسان ورمێ، کە جیهادی نەتەوایەتی کرد و دوایی وەک هەمیشە بە کوشتنی کۆتایی هات، ڕۆژنامەکەی، کە بیری خۆی تێدا بڵاو دەکردەوە، بە کوردی بوو.

دیاردەی نەبوونی نووسینی کوردی لە سەردەمانێکدا کە نەتەوەکانی تێدا لەناودەچوون، لە پەیوەندییە فەرهەنگییەکاندا کێشەی بۆ بەجێ هێشتوین و ئێستاش بە دەست ئەو کێشانەوە دەناڵێنین و ئەوەندەش گەورەن مەودای ئەوە نادەن کورد لە داهێنانی کێشەدا ئەویندراری خۆی بکا. زۆر بە لامەوە ناخۆش بووە کە دیومە لە گۆڤارێکی کوردیدا وشەیان لە نووسینمدا لابردووە یا گۆڕیوە چونکە گومانیان کردووە فارسی بووبێ و ئەو ترسەشیان بۆ ئەوە گەڕاندۆتەوە گوتەگوت لە سەر وشەی لەو بابەتەی نووسەری تر هەبووە. من هەر بە سروشتی خۆم لایەنگری ئەوە نیم دەسبەرداری وشەی باو بم چونکە هەموو وشەیەکی بەربڵاو لە سەر زاری خەڵکی کورد لە لایەن منەوە بەخێرهاتن دەکرێ و دوو شت نەبێ هیچیان جیا ناکەمەوە: یەکەمیان ئەوەیە ئاوازەکەی

کوردی نەبێ و لە قورگدا توند و تیژ بێ. ئەوی تریشیان ئەوەیە لە ئاخاوتنی کوردیدا بتفێندرێتەوە، خۆم لەوەشیان لادەدەم با کوردیش بێ. ئەوەی تەماشای قامووسە عارەبییەکان بکا دەبینێ قامووسی زمانی هەندێ زمانی تری لەخۆ گرتووە و هەندێکیان بە ڕەو کۆچیان کردووە و نەماون. هەر وشەیەکی لە ئاڤێستادا هەبێ کوردیە و بوونی لە ئاڤێستادا بەڵگەیە بۆ ڕەسەنایەتی ئەو وشە کوردییە و بە بێ هیچ دەمەتەقێیەک پێی دەچێ، جا لە زمانە ئێرانیەکانی تردا دەرکەوتبێ یا دەرنەکەوتبێ.

بۆ ڕەواندنەوەی گومان و نموونە لە سەر ئەوەی کە گوتم، کورد دوو وشەی بۆ «ڕەش» هەیە. بەشێکی کورد «ڕەش» بەکار دێنێ و کەس نازانێ سەرچاوەی چییە و کەنگێ و چۆن پەیدا بووە. بەشێکیشی «سیا» بە کار دێنێ و وشەی تر لە جێیدا نازانێ. ئەم «سیا»یە لە «سیاه»ی فارسییەوە نێزیکە و ئەوەش سەیر نییە چونکە لە ئاڤێستادا هەیە و لە کوردیدا لە «ڕەش» ڕەسەنترە. ئەوەی جێی داخیشە ماڵی خۆمان لە ناو ماڵاندا بە سەر ناکەینەوە... ئەمە دەڵێم چونکە زۆر لەوانەی «ڕەش» بەکار دێنن نازانن سیا کوردییە و لە کوردیدا ڕەگی ئەوەندە قووڵە، لە هیچ زمانێکی تردا وا نییە، ئەوەش بە هۆی بوونیەوە لە ئاڤێستادا و ئەم پەیوەندییەش بۆ کوردبوونی ئەو وشەیە بەسە.

ئەوانەی سیا بەکار دێنن، ماڵیان ئاوا بێ دەسبەرداری نەبوونە و «سیایی»شیان لێ داتاشیوە کە لستەی کڕین و فرۆشتنی بابەت دەگەیەنێ. فارسەکان بەو واتایە «سیاهە» بەکار دێنن و لەو داتاشینەدا لە کوردی جیا دەبنەوە و با هەر وا بکەن. ئەگەر ئێمە دەسبەرداری «سیایی» بین وشەیەکی تر نابینین جێگای پڕ بکاتەوە، چونکە لە «ڕەش» هیچمان بەو واتایە دانەتاشیوە و هۆیەکەش ئەوەیە کە وشەیەکی تازەیە و دوور نییە پەیوەندی بە «ڕەژوو»ەوە هەبێ

چونکە وشەکە، ناوەکە و واتاکە لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە. بەڵام تەمەنی وشەکەی دی بۆ سەردەمی ئاڤێستا دەگەڕێتەوە کە دووهەزار و شەشسەد ساڵە و چەند سەدەیەک پێشتریش کە سەرەتاکەی نازانین بەڵام لە سێ هەزار ساڵ پترە. خۆ ئەگەر کوردێک لە ترسی تەڵەی فارسی بتوانێ واز لە «سیا و سیایی» بێنێ، دەتوانێ سبەی وامان لێ بکا دەسبەرداری لووتمان بین تا جیاوازیمان لەگەڵ فارسدا زیاتر بێ و ئەوجا سامانی نوکتەی میللەتان دەوڵەمەندتر دەبێ و «کوردەکە! کوا کەپووت؟»یش دەچێتە سەر «کوردەکە! کوا گوێچکەت؟»... لاحەولەوەلا...

کڕنۆشبردن لە دەرباری سوڵتاندا داهێنانێک نییە بە تایبەتی کورد یا غەیرە کورد دایهێنابێ، بەڵکو یەکێکە لە خەسڵەتەکانی دەروون و جۆرێکە لە خۆبەستنەوە بە مانەوە جا ئەگەر بۆ بەدەستهێنانی سوود و دەسکەوت بێ یا ڕەواندنەوەی مەترسی. لەگەڵ ئەو بەڵگەنەویستە باوەدا کە لە خوێنماندایە لە ناو شاعیران و نووسەرانی پاشاکاندا یەک کورد نابینین و نەمانبیستووە هیچ یەکێ لە زانا گەورەکانی کورد بیانووی بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆی هێنابێتەوە. ئەوەش ناڵێم ئەوە بە هۆی نەفسبەرزی کوردەوە بووە و میللەتانی تر لە خۆتێهەڵسووندا وا نەبوون، بەڵکو بە هۆی لووتبەرزی شایەکانەوە بووە لە داڵدەنەدانی کورد و هەروەها کەمیی ڕۆڵیان و دووریی مەودای نێوانیان. ئەگەر ئەدیبێکی کورد یا ناکورد بڵێ کورد خۆی لەوە بە گەورەتر زانیوە لە بەر تەماحی سوڵتان و شایەکان نەرم بێ تا دەسکەوتی لێیان دەسکەوێ، ئەوە دەگوترێ کە »ڕێوی دەمی بە پەرسیلە نەدەگەیشت دەیگوت ترشە«. بەڵام باسی زانایان شتێکی ترە و لە پەرسیلەدا سنووردار ناکرێ چونکە ئەوانەی خۆیان لە شایەکان شاردەوە لە ڕووی باوەڕەوە ئەوەیان کرد و

باپیره گەورەی بنەماڵەی حەیدەری و مەلا ئەفەندی هەولێر بە هۆی سوور بوونی شا ئیسماعیلی سەفەوییەوە بۆ گۆڕینی مەزەبیان، خۆیان لە ماڵ و حاڵی خۆیان داماڵاند و کوردستانی ئێرانیان بەجێ هێشت و ویژدانی خۆیانیان دەرباز کرد. ئەوەی ئەوان کردیان سەیر نەبوو چونکە پێمان سەیر نییە مرۆڤی نیەتڕاست لە سەر مەزەبێکی سیاسی وا سوور بێ کە نە پەرستراوی تێدا بێ نە بەهەشت و نە ئاگر. لە ناوەڕاستی چلەکانی سەدەی بیستدا کارەساتەکە دووبارە دەبێتەوە و لاپەڕەیەکی تری چارەنووسی کورد بە هەڵواسینی قازی محەمەد و خەڵکی تر لە خزمەکانی لە گۆڕەپانی «چلچرا - چوارچرا ح.ک»ی مەهاباد دادەخرێتەوە و ئەوانیش دەبنە قوربانی خۆ هەڵواسینیان بە ڕیشووی مانەوەی نەتەوایەتییەوە. قازییش نووکی ئایینی بنەماڵەیەکی گەورە بوو لە کوردستانی ئێراندا کە سەرکردایەتی بزووتنەوەی داخوازی مانەوەی دەکرد و لاوانی خوێنگەرم و کوردی خاوەن کەرامەت بەشدارییان تێدا کرد و بە دەم ددانی مشاری مێژووەوە هەڵوەرین.

باسی مامەحەمەیی لە دەربارەدا، دەرگایەک لە سەر هەندێ ڕووداوی زمان دەکاتەوە و ڕەنگە زانینی سەرچاوەی وشەیەکی بەکارهێندراو لە نێوان دوو نەتەوەی ڕەگەزجیادا بە زەحمەت بناسرێتەوە. ئەو پێوانەکاریانەی خەڵکی سەر بە وشە پەنای بۆ دەبەن ئەوەیە لە گۆشەی دەسەڵات و ملکەچییەوە بڕوانن چونکە زۆر جار، هەر ئەوەش چاوەڕوان دەکرێ، کە وشە لە سەرەوە بەرەو خوار، واتە لە دەسەڵاتەوە بەرەو ژێردەستە و لە سەرکەوتووەوە بەرەو دۆڕاو دادەبەزێ. لە بواری پەیوەندی نێوان عارەب و فارسدا، سەرکەوتنی چەندین سەدەی دوور و درێژی هەخامەنشی و پارتیەکان و ساسانیەکان بە سەر عیراقدا بۆتە جێی باوەڕی ئەوەی کە وشەی ئێرانی بۆ عیراقی سامی گوازراونەتەوە.

زانا زمانەوانەکانی ئیسلام زۆربەی ئەو وشە هاوبەشانەیان ژماردوون کە لە نێوان فارسی و عارەبیدا هەن و بە پێوانە و دەستووری عارەبییان لەگەڵدا ناکرێ لە بواری شیکردنەوە و خواستنەوەدا ئەوەش بە پێی یاسای دابەزین لە سەرەوەڕا. کاتێ هۆش لە سەردەمی ئێمەدا و لە هەموو بوارەکانی دید و پیوانەکاری تازەبابەتی پێوانە و ئەنجامگیری و توێژینەوە لە بواری زماندا کرایەوە، دەرکەوت زۆر لەو وشانەی کەلە سەر فارسی حسێب دەکران لە بنەڕەتدا بابلی یا ئەکەدی یا ئاشوورین و هەندێکیان سۆمەرین و مامۆستا تاها باقری خوالێخۆشبوو کتێبێکی لە سەر ئەو وشانە نووسی - ڕەنگە نەختێ بەرفرەوانی تێدا کردبێ - سەرچاوە نافارسیەکانیان و ڕەچەڵەکیانی ئاشکرا کردووە. ئاشکرایە بوونی سەرچاوەی ئەو وشانە لە ئەکەدی و بابلیدا بەڵگەیەکی نوێیە بۆ گواستنەوەی وشە بە ئاڕاستەی سەرەو خوار و جیاوازی تەرازووی هێز لە نێوان فارسی لاواز لە سەرەتادا لەگەڵ شارستانەتی ڕەگداکوتاوی عیراقی ئەو سەردەمانەی سامی و سۆمەریدا ئاشکرایە. لە لاپەڕە 204 و 205ی بەشی یەکەمی کتێبی «تاریخ زبان فارسی»ی ناوبراودا ئەوە دەخوێنینەوە: ئەو کاروبارانەی بە بەڕێوەبەرایەتی دەسەڵاتی سەردەمی هەخامەنشییەوە وابەستە بوون، بە ئارامی دەنووسران و هەندێ بەڵگەنامەی بەڕێوەبەرایەتی ئەو سەردەمە کە دەست کەوتن، بە ئارامی لە سەر پێست نووسرابوون و هی کۆتاییەکانی سەدەی پێنجەمی پێش زاین بوون، هەروەها لە کۆشکی شاهانشای هەخامەنشی لە تەختی جەمشید نێزیکەی سیی هەزار لەوحە قوڕ دۆزرانەوە کە بە زمانی عیلامی نووسرابوون، ئەوەش بەوە لێکدەدرێتەوە کە دەسەڵاتداری هەخامەنشی لە سەرەتاوە و تا ماوەیەکی دوور و درێژ توانایەکی ئەوتۆی نەبووە ژمارەیەکی وا لە نووسەرانی فارسی کۆن کۆ بکاتەوە بەڵگەنامە

ئیمپراتۆریەکان تۆمار بکەن کە لە ماوەیەکی کورتی سەرسوڕهێنەردا پەرەی سەند، لە بەر ئەوە بە ناچاری پەنایان بۆ نووسەرانی میللەتانی دی برد کە لەو بوارەدا شارەزاییان هەبوو. تا دوای قادسیەی یەکەم کە زەمان گۆڕا و بارودۆخ تێکچوو و کەلەپووری قورئان هەرچی کەلەپوورێکی کۆن هەبوو و هاتە پێشی ڕایماڵی. دەبینین فارسی شانازی بەو وشانەوە دەکا کە چوونەتە ناو فارسییەوە و تەنانەت عارەب بەخۆشیان بە دەگمەن بەکاریان دەهێنا و لەم سەردەمەدا و لە وێستگەی بەنزینی فارسی لافیتە دەخوێنینەوە لێی نووسراوە: استعمال دخانيات اكيدا ممنوع است.

زمانی کوردیش لەو بوارەدا وەک زمانەکانی تره و ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەو وشە عارەبییانەی تێکەوتن کە پەیوەندییان بە باوەڕ و خواپەرستی و زانستی ئیسلام و سەرجەم ڕۆشنبیرییەوە هەیە و بەکارهێنانیان بۆ کەس کەمایەتی نییە بۆ ئەوانە نەبێ بەرەنگاری باو دەبنەوە. خۆشبەختانە لە هەندێ ڕووی بەختەوە، فەرهەنگی کوردی لەو دەمەوە کە لە زەردەشتی جیا بووەوە و بە هۆی دوورییەوە لە چەقی دەسەڵات و شارستانەتیەوە و بەر لەوەی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە فارسییەوە هەبێ، لە ئەنجامدا قامووسی ئەو وشانەی لە دەست دا کە پەیوەندییان بە ئایینە کۆنەکەیانەوە هەبوو و ئەگەر وشەی وەک athaurva و rathashta و vastyo fshuyas بدەینە بەر بای گوێی ڕۆشنبیری کورد، لە خەونیشدا نازانێ ئەوانە سێ چینی کۆمەڵگان و لە ئاڤێستادا هاتوون و مەبەستیش ڕۆحانی و سەرباز و وەرزێرە و وشەی «ئەرتەش»ی فارسی کە سەربازی دەگەیەنی، سەرەتاکەی وشەی دووەمە و سێیەمیش سەرەتای «کشاورز»ی فارسیە کە دەکاتە وەرزێر. بەڵام یەکەمیان، ئاشکرایە لەوەوە هاتووە کە لە سەرەتای ئەم

باسـەدا باسـمان کـرد، haurva کە واتـای «تەواو - کامیـل» دەدا و هەمـان «ئیـرۆ»ی کـوردییە. ئەو وشـانە لە ئاڤێسـتای تـازەدا هەن بەڵام «gatha» کە کۆنترین بەشی ئاڤێستایە، بە شێوەیەکی دی هاتووە و زیاتر جێی ئەوەیە کورد بە زمانەکەی خۆی ڕازی بێ، چونکە وشەی یەکەم «airyama» بە واتای هاوڕێ، هەڤاڵ و هەمان وشەی «یار»ی کـوردی نـوێیە. دووەمـیش «awetush ـ خڤەئیتـوش» بـوو بە واتای «ئەندامی دەستە» و وەختە هاوتای «خۆیەتی» بێ بە هەمان واتا و دوومـیش verezeno ڤەرەزەنـو بە واتـای «وەرزێـر»ی کـوردی بە دەنگ و واتاوە. وشەی gatha خۆی لە بنەڕەتدا دوعا و نزا دەگەیەنێ و لە شێوەزاری عەشرەتی دزەیی دەوروبەری مەخمووردا بۆتە «گاس» بە واتای بانگکردن و «ث» لە کوردیدا بزر بووە و وەرگەڕا و ئەگەر کورد gatha بخوێنێتەوە دەیکاتە «گاسا». ئەوەندەی من بزانم دەنگی «ث» لە وڵاتی کورددا تەنها لە ناوچەی هەورامانـدا ماوەتەوە. لە بارەی ئەم وشـانەوە بگەڕێـوە بـۆ «مزدیسـنا و ادب پارسـی ل 178، 179» بەڵام دەرهێنانی شێوەکانیان سەرنجی خۆمن.

ئەوە هەنـدێ بـوو لە لایەن و پەراوێـزی پەیوەنـدی نێـوان کـوردی و ناکوردی زمانە ئێرانیەکان بە فارسییەوە، لەگەڵ کەمێ لە پەیوەندییە جەوهەرییەکانی نێوانیان و ئەگەر لێکۆڵەرەوەیەک بە قووڵیی و فرەوانی ورد بێتەوە سەرنج و هەواڵ و وانەی سەیر و سەمەرەی زۆر دەست دەکەون و هەموویـان گومـان دەرەوێنـنەوە و خەیـاڵ ئاشـکرا دەکەن: کوشندەترین شت لە مێژووی کورددا ئەوەیە دەربازبوونی زمانەکەی لە چنگی فارسی بە نرخی چارەنووس ئەنجام درا کە 25 یا 26 سەدە درێـژەی کێشـا. ئەمـڕۆش کوشـندەترین شـتی زمـانەکەی ئەوەیە بێتـاوانیەکەی لە تـۆمەت بە پـاککردنەوەیەک بـێ کە لە ڕاسـتیدا

کەوڵکردنێتی و بەوەش کورد بە هەوەسی خۆی تەرمی زمانەکەی خۆی دەداتە فارسی و لەوە خاترجەمی دەکا کە بە درێژایی مێژوو نەیتوانیوە کوردی سەربڕێ.

دوای ئەوەی هەندێ مەسەلەی ئاڤێستا و زمانی فارسی باس کران، قسەکردن لە بارەی پەهلەوییەوە تویشەبەرەی کەممەسرەفتر دەبێ چونکە لە تویێ قسەکانماندا باس و ئاماژە بۆ پەهلەوی هەبوون.

ئەوەی لە بارەی ئەو زمانەوە نەگۆڕە، ناوەکەیەتی کە لە سەرچاوەی کۆنترەوە هاتووە و لە نووسینی فارسی کۆندا بە شێوەی «پرتو - پەرتەوە» بە ناوچەی خوراسانی ئەمرۆ گوتراوە، کە کەوتۆتە باشووری خۆرهەلاتی ولاتی فارسەوە و ئەوەش ئەو خاکەیە کە حکوومەتی ئەشکانی لە ناوەڕاستی سەدەی سێیەمی پێش زاین تێیدا وەک زلهێزێک ڕسکا و سلوکیەکانی تێکشکاند. ئاشکرایە دوای ئەوەی دەسەلات کەوتە دەست ئەشکانیەکانەوە (ناوەکە بۆ ئەشک یا ئەرشاک دەگەڕێتەوە کە بە سەر سلوکیەکاندا سەرکەوت) 250 پ ز زمانە پەهلەوییەکەیان بەهێز بوو (وشەکە لە پەرثەوەوە گۆڕاوە) زمانەکە لە هەمان کاتدا بووە زمانی دنیا و دین چونکە ئەوەی دەسەلاتی دنیایی هەبووبێ لەو سەردەمانەدا دەسەلاتی دینیشیان دەدایە پاڵ خۆیان. ئەوەی بەلگە نەویستە ئەوەیە پەهلەوی بە چەندین سەدەی دوورودرێژ بەر لە دەسەلاتی ئەشکانیەکان شانبەشانی ئاڤێستا و فارسی کۆن بوونێکی تۆمارکراوی هەبوو، تا دەگەیشتە سەرچاوەکەی لە خێلە هندوئەورووپیەکان کە وەک هەموو گەلە ئاریەکان و ئەورووپیەکان لە یەک ئاستدا بوون چونکە گەلێک نەبوو لە یەکەم و دووەم دابڕاندا لە یەکێ لە زمانە کۆنەکانی ئەو گەلانەوە گەشەی کردبێ. لێکچوونی شێوازی تۆمارکراوی پەهلەوی و پارسی و هەخامەنشی لە لێکچوونی نێوان پارسی هەخامەنشی و فارسی نوێ زیاترە و ئەگەر فارسی

بگەڕایەتەوە دەستی دەسەڵات و میراتی کەلەپووری ئێرانی یەکجار زۆر زەحمەت دەبوو ئەو پردانە دروست بکا و لە گرێدانی پەیوەندی نێزیکایەتی نێوان فارسی کۆن و نوێ بەردەوام بێ چونکە ئەگەر فارسی بە بێ حکومەت و تۆمارکردن بمابایەتەوە دەبووە چەند شێوەزارێکی لێکدابڕاوی جیاواز و جیاوازییان هەندەی جیاوازی ئاشکرای نێوان کوردی سەردەم و ئاڤێستا، بگرە زیاتریش دەبوو: ئەوەش لەبەر ئەوەی فارسی بنەچەیەکی تۆمارکراوی کۆنینەی نییە تا لەگەڵ پاشماوەی ئاڤێستادا بە یەک بپێورێن و چوارسەد وشە لە کوێ و 83000 وشە لە کوێ؟ پەیوەندی کۆنی ئەم شێوازانە لە کوێ و هی تازەیان لە کوێ؟ کوا پەیوەندی نێوان ئەم وشە کۆنانەی خوارەوە لەگەڵ وشەی نوێدا:

| شێوازی کۆن | شێوازی نوێ | واتایان بەکوردی |
|---|---|---|
| ئیدی idiy | برەو | برۆ |
| ئەداتوڤ adatuv | برەوەد | با بڕوات |
| مەنیاهەئی | بیەندیشی | بیر بکەوە |
| ئاهەم | بودەم | بووم |
| پەتی پیە خوڤا | خودرا نیگەهدار | ئاگاداری خۆت بە |

بۆ ئەوە تەماشای لاپەڕە 234 و 235ی تاریخ زبان فارسی ناوبراو بکە.

ئەگەر بشێ ئەو وشانە بۆ فارسی کۆن بگێرینەوە، دەشێ بۆ هەر شێوازێکی دی بیانگێرینەوە هەخامەنشی نەبێ کە لەو سەردەمەدا بووە. لە ڕاستیدا، بە پێی بۆچوونی زۆربەی نووسەرە ئیسلامیەکان، فارسی و پەهلەوی تێکەڵاوی یەکتر بوونە و هەندێ لەو نووسەرانە یەکسانی کردوون و هی تریان فارسییان دابەش کردووە و پێیان وایە پەهلەوی بەشێکیتی و هی تریشیان بە لایەکی تردا چوونە کە ئێرە جێی باسکردنی نییە و کەمێکی زۆر کەمیشیان بە دوو زمانی جیاوازیان داناون. پەهلەوی، خەتێکی تایبەتی بۆ نووسین لە ئارامی داتاشی. هەخامەنشیەکان خەتی بزمارییان هەبوو بەڵام لە بەر زەحمەتی بەکارهێنانی ئەو خەتە، ئەوانیش پەنایان بۆ ئارامی برد. ئەوەی تا ئێستا لە بەڵگەنامەی پەهلەوی سەردەمی ئەشکانیەکان دەست کەوتووە، زۆر کەمە و هەرە کۆنەکانیان دوو «گرێبەند ـ قەواڵە»ی ئاڵووێرن و لە هەورامان دەست کەوتوون (هەورامان ناوچەیەکی کوردنشینە کەوتۆتە هەردوو بەری سنووری نێوان وڵاتی فارس و عیراقەوە و بە تەنیشت هەڵەبجەوەیە، لە پارێزگای سلێمانی) مێژووی ئەو دوو گرێبەندە بۆ یەکەم سەدەی پ ز دەگەرێتەوە و کۆنەکەیان هی ساڵی (88ی پ ز)ە و تازەکەشیان ڕێی تێ دەچێ ساڵی (12 ی)پ ز یا (88ی)ز نووسرابێ (تەماشای ل 251 و 252ی کتێبی تاریخ زبان فارسی بکە). یەکەمیان لە بنەڕەتدا بە یۆنانی نووسراوە و وشەی پەهلەوی لە پشتەکەی هەن، دووەمیشیان هەمووی پەهلەوییە و ئەوەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی زمانی سلوکی لەو سەردەمەدا بەکار نەهێندراوە. بەڵام ساسانیەکان ماوەیەکی دوور و درێژ لە سەر بەکارهێنانی زمان و خەتی پەهلەوی مانەوە و شوێنەواری زۆرمان لەوانەوە پێ گەیشتوون. کەچی خەتی پەهلەوی داتاشراو لە ئارامی بە جۆرێ گۆڕدرا هەندێ لە زەحمەتییەکانی کە لە

خوێندنەوەدا هەبوون لاکەوتن و ئەو شێوە گۆڕاوە لای ساسانیەکان بووە خەتی بەکارهێندراو. پەهلەوی بەخۆی، بە پێی بۆچوونی زانا ئێرانیەکان بووە دوو بەشەوە: یەکەمیان ئەو پەهلەویە بوو کە لە ناوچەکەی خۆیدا، کە کەوتبووە باکووری ڕۆژهەلاتەوە، بەکار دەهێندرا. دووەمیان ئەو پەهلەویە بوو کە ولاتی پارس، لە باکووری ڕۆژاوای ئێران بە تەنیشت ئەو فارسییەوە بوون کە زمانی ئاخاوتنی ئەو ولاتە بوو، بەکار دەهێندرا. ئەم پەهلەویە بە «پارسیک» ناوی دەرچووبوو تا لە پەهلەوی یەکەم و زمانی فارسی کە سەرچاوەکەی هەخامەنشی بوو و پەرشوبلاو ببۆوە و بە فارسی نوێ دەناسرێ جیا بکرێتەوە. جیاوازی نێوان پەهلەوی (ناویان نا پەهلەوانیک) و «پارسیک» زۆر کەمە بەلام هەیە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو جیاوازییە پەنامان بۆ ئەم ڕستانەی خوارەوە برد کە هی پارسیک و پەهلەوانین و لە شوێنەوارێکی ئەردەشێر بابکانەوە (دامەزرێنەری دەولەتی ساسانی 226ی پ ز) گوازراونەتەوە.

1. پتکرا این مزدیسن بغ ارتخشتر

1. پتکر ام مزدیسن بغ ارتخشتر

2. شاهان شاه ایران کی چهر

2. شاهین شاه اریان کی چهر

3. هیچ یزدان پس بغ پاپک شاه

3. هیچ پزتان بوهر بغ پاپک شاه

یەکەم شـێوازی هەر ڕسـتەیەک پارسـیکە و دوومـیش پەهلەوانـیکە. واتاشـیان: ئەمە پەیـکەری شـایە، مەزدیەسـنا، ئەردەشـیر، شاهەنشـای ئێران... هتـد. ڕستەکانیشـمان لە ل 255ی کتێبـی تـاریخ زبـان فارسـی، بەشی یەکەمەوە گواستۆتەوە.

دوای گرێبەنـدەکانی هەورامـان نووسـین و بەڵگەنامەی زۆرمـان دەسـت کەوتوون، لەوانە، کتێبی کارنامەی ئەردەشێر بابکانە و «ئەرداڤیرافنامە» و زەنـد ئاڤێسـتا و کتێبـی ئـایینی تـری زەردەشـتی و مـانەوی لەگەڵ شوێنەواری ئەدەبی دەرەوەی بازنەی ئایین، وەک دەسـەڵات و مێـژووی تێکەڵی داستان و شتی تر...

ڕەنـگە کەڵکـی هەبـێ لێـرەدا ئەوە بڵێـین کە «زەندئاڤێسـتا» تەفسـیری پەهـلەوی سـەردەمی ساسـانیەکانە و بـۆ ئاڤێسـتا کـراوە و «شـەرحی ئاڤێستا» دەگەیەنێ و لێکدانەوەکەش لە «zanti زەنتـی» وەرگیـراوە کە ڕەگەکەی «zan زەن»ی ئاڤێسـتاییە و «dan دەن»ی پارسـی کـۆن بەرانبەرێتی کە واتای زانست و زانیاری دەدا و هەردوو وشەی «زەن و دەن» بە شـێوازی خۆیـان دابەزیـون و لە کوردیـدا بـوونەتە «زانـین و زان» کە لە ئاڤێستاوە گوازراونەتەوە بە نیشانەی جیاکەرەوەی «د»ی سەرەتایەوە هاتووە. ڕەگیش لە هەردووکیاندا «زان و دان»ە و ئاشکرایە پەهلەوی بە هێشتنەوەی «ز» لە «زەند»دا هاوبەشی کوردییە. یەکێ لە خەسڵەتە هاوبەشەکانی پەهلەوی و کوردی ئەوەیە کرداری ڕابردە لە پەهلەوی و شێوەزاری باکووری کوردیدا بە پێشخستنی جێناوی بکەر بە سـەر کـرداردا و ئینگلیـزیش لە هەمـوو کردارەکانـدا وا دەکـا. ئەوجـا کـوردی و پەهـلەوی جێنـاوی بـکەر لە هەمـوو کردارێکـی ڕابـردە و داهاتوودا دوا دەخەن و هەموو زاراوە کوردییە ناسراوەکان لەوەدا وەک یەکن. وا باوە کە شێوازی هەورامـی کوردی لە پەهلەوی دەچـێ و بـۆم

هەڵنەکەوتووە لەو لایەنە ورد ببمەوە و ڕای گردەبڕی لە سەر دەربڕم بەڵام ئەو دوو بەرانبەرەی سەرەوە لەوەدا بێ بەڵگە نین کە سەر بە هەورامین چونکە ئاخاوتنی ڕۆژانەی ئاسایی خەڵک تۆمار دەکەن کە چ خەسڵەتێکی ڕەسمییان نییە تا ئەو گومانە بکرێ کە بە زمانی بێگانە بۆیان نووسرابێ. ئەوەی ئەم بۆچوونەم پتر پشتئەستوور دەکا قسەیەکی شەمسەددین محەمەد کوڕی قەیس ئەلرازییە کە لە کتێبی «المعجم في معايير اشعار العجم»دا نووسیویەتی و وەرگێڕانەکەی دەبێتە: خەڵکی عیراقم دیت سەرگەرمی دارشتنی ئاوازی ئەدەبیاتی فەهلەوی بوون و تەنانەت بە ئاوازێکی ناخۆش گوتەی عارەب و غەزەلی دری «فارسی» دڵ و دەروونی دەهەژاندن، وەک:

لحن اورامن و بيت پهلوی
زەخمەء رود و سماعی خسروی

بۆ ئەمە، سەرنجی ل 249ی کتێبی تاریخ زبان فارسی بدەن، دەقەکەشم بەرچاو نەکەوتووە تا بزانم بە عارەبییە یا لە قامووسەوە، لە ناعارەبییەوە گوازراوەتەوە بۆ کتێبی «تاریخ زبان فارسی» وەک لە فارسیدا باوە، بێ ئەوەی لە عارەبییەوە وەربگێڕدرێ.

نیوەی یەکەمی بەیتەکە کە واتای «ئاوازی هەورامی و بەیتی پەهلەوی» دەدا، پێداهەڵدانی تێدایە بۆ ئاوازی هەورامی و ئاسان نییە ئاوازی گۆرانی لە وشەکانی جیا بکرێتەوە و ئەگەر پەهلەوی لەوە زیاتر بڵاو بووبێتەوە لە هەورامان گیری خواردبێ ئەوە ڕێگر نییە لە بەردەم ئەوەی زمانی هەورامان پەهلەوی بووبێ و ئاوازەکە سەرچاوەی

هەورامـانییە و زمـانەکەش زمـانی گشـتیی خەڵکـی وڵاتە و ئـاوازیش تایبەتمەندیی ناوچەکەیە، وەک بڵێی: فلانە کەس شیعرێکی عارەبی بە ئاوازی شامی یا قاهیری یا بەغدایی گوتووە. ئەوجا هەورامان ناوچەیەکی بەریـن نیـیە و بە دەسـەڵاتداریی نـاوی دەرنەچـووە تـا ئـاوازی ئەوەنـدە بەناوبانـگ بـێ زمـانی تـر سـواری سـەری بـێ. لە هەمـوو حاڵێکـدا، ئەو سەرسوڕمانە دەمێنێ کە ئاوازی هەورامانی بڵاو بێتەوە و بەناوبانگ بێ تا شیعری زمانێکی تر تەواو داگیر بکا. لەم ڕۆژگارەی ئێستادا ئاوازی تایبەت بە خۆی هەیە و وەها ناوی پێوە دەرچووە هیچ جێیەکی تری ئەم جیهانە تایبەتمەندی وای لە ئاوازدا نییە. ئێستا مەودای ئەوە نییە باسی تایبەتمەندیەکانی ئەو ئاوازە بکەیـن کە لەرەیەکـی تێـدایە هـیچ قوڕگێکی تر، ئەگەر لەگەڵیدا ڕانەهاتبێ پێی ناوەستێ تا دەگەیـنە ئەوەی بپرسـین ئـاخۆ ڕێـی تـێ دەچـێ لەرە لە ئـاوازی فارسـی سـەردەمدا کە تایبەتمەنـدیی خـۆی هەیە، لە ئـاوازی هەورامـان وەریـانگرتبێ؟ لە کوردستاندا، بە هەموو بەشەکانیەوە لە شێوەی ئەو ئاوازە نییە! زەرەری نیـیە ئەگەر بڵـێم بەشـێک لەو شـێوە تـایبەتییەی هەورامـان لە دەنگـی لێهاتوانی ئاوازی عیراقدا بە بچڕاوی دەردەکەوێ بە تـایبەتی لە دەنگی نەجمەددیـن شـێخلی و بە شێوەیەکی کەمتـر مـحەمەد گوبـانچی و لە هەنـدێکی تریشـەوە بە شێوەیەکی خنکـاو و کەرخ و گـڕ و مانـدووبوون دەردەکەوێ کە توانـای دەرهێنـانی کەمتریـان هەیە. لەگەڵ ئەوەشـدا بـابەتەکە بـۆ لێکـۆڵینەوەی فرەوانتـر بە کراوەیـی دەمێنێـتەوە تـا بە ئەنجـامێکی گردەبـڕ بگەیـن. ئەنجـامی وردبـوونەوەش هەرچیـیەک بـێ گەرد ناخاتە سەر هەورامان و لە شتێکدا لۆمەی ناکرێ کە لە مێـژوودا، بە شێوەیەک لە شـێوەکان ڕووی داوە و کوردسـتانی لە پشـتە و زمـانی کوردی بە پاکژی و پتەوی و سـەربەخۆیی لێـی دەرهـاتووە، جگە لەوەی

کە پەهلەوی فارسی نییە و سەرجەمی باسەکەش شارستانەتییە لەگەڵ هەندێ تیشکدانەوەدا و چ پێویست بە دڵەڕاوکێ ناکا.

لە پەنا و پەسێوی خوێندنەوەمدا بۆ پەهلەوی بینیومە، وەک خەڵکی تریش دیویانە، وشەی زۆر هەن، هاوشێوەیان لە کوردی سەردەمیشیدا هەیە و نەمزانیوە لە فارسیدا هەبێ، یا شێوەیان لە کوردیدا لەو شێوانە نێزیکترە کە لە فارسیدا هەیە. دیاردەیەکی تری هاوشێوەم زانی کە لە هەندێ شێوەزاری کوردیدا لە کوردستانی عیراق کردارەکان لە سەر شێوەی پەهلەوی دەگۆڕێن بە تایبەتی ئەوانەی دەنگی «د» بە دوایاندا دێ، ئەو شێوەزارانە دەیکەنە «ت» و لە پەهلەویشدا وایە. ئەو شێوەزارانە لە بری «کردن و مردن» دەڵێن «کرتن، مرتن». بێ گومان وردبوونەوە هەندێ ڕووی تری لەو بابەتە لە نێوان شێوەزارە کوردییەکان، یا هەندێکیاندا لەگەڵ پەهلەویدا دەردەخا، ئەوەش بە هۆی گەڕانەوەیان بۆ یەک سەرچاوەی ئێرانی و نێزیکایەتیشیان لە یەکترەوە، شتێکی تریش هەیە کوردی و پەهلەوی کۆ دەکاتەوە و لەو دووەدا نەبێ ئەوە نییە:

ئەو دراوە هاوبەشەی نێوانیان، ئاڤێستایە کە یا کوردیە و لە خاکی پەهلەویدا، لە خوراسان دەرکەوتووە یا پەهلەوییەکی کۆنە و بە زمانی کوردی قسەیان پێ کردووە و پەیوەندی نێوانی لەگەڵ کوردیدا لەو دەقە ئاینییانەدا بەردەوام بووە کە کورد باوەڕی پێیان هەبووە. ئەمە ڕاستییەکی گەورەیە و کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە چونکە ئەو دەنگە زۆر کزە کە هەق وایە بەرز بێتەوە. نە پەهلەوی قسەکەرێک بە ناویەوە هەیە لە خاکی خوراسانەوە دەنگ هەڵبڕێ و نە کورد کەس گوێ لە دەنگی دەگرێ ئەگەر دەنگێکی لێوە بێ کە تا ئێستا شتی وا نەبووە.

کوردی بە زندوویی ماوەتەوە بەڵام پەهلەوی شوێنەواری سەربەخۆی نەماوە لە فارسی جیا بێ و بە هۆی گواستنەوەی دەسەڵاتەوە بۆ فارسەکان، هەموو ئەو زمانانەی نووسینیان هەبووبێ لە سەردەمی ساسانیەکاندا بوونە بەشێک لە کەلەپووری فارسی و خوراسانیش، بە خۆی و کەلەپووریەوە لە ماوەی چوارسەد ساڵدا کەوتە بەر دەستیان و تا هاتنی ئیسلام هەموو ئەو زمانانەی تێدا توانەوە. توانای ئەوە نییە مەزەندە لێ بدرێ ئاخۆ بە دووری و نێزیکی لەگەڵ کوردیدا چی ڕووی دەدا چونکە جگە لە شێوەیەکی تۆمارکراوی پەهلەوی کە ماوەی چەند سەدەیەک وەک زمانی دەوڵەتی و فەرهەنگی لە سەردەمی ئەشکانیدا و دوایی لە ماوەیەکی دەسەڵاتی ساسانیدا برەوی هەبوو و دواتر، چەند سەدەیەکی دوای هاتنی ئیسلام شانبەشانی فارسی بوو و لە کاروباری ڕۆژانە و ڕێوڕەسمی ئایینیی زەردەشتیدا بەکار دەهێندرا و ئەوجا، هەزار ساڵێک دەبێ، لە هەندێ شوێنی بەرتەسکدا نەبێ کە هەناسەی تێدا دەدا، لاپەڕەکەی داخرا، پێوانەی ترمان بۆ ئەو بەراوردکارییە لە بەر دەستدا نییە.

پەهلەوی بە زمانی سەردەمی ناوەڕاست دادەنرێ، نەخێر لە دوای هێرشی ئەسکەندەرەوە، بە تاکە زمانی سەردەمی ناوەڕاست دادەنرێ تا ماوەیەکی زۆر دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ساسانی ساڵی 331 پ ز و هەتا دوای ساڵی 226 ی ز. جگە لە زمانی ئاڤێستا بە پلەی یەکەم و فارسی کۆن (ئەخمینی) بە پلەی دووەم، زمانی ترمان نییە نوێنەرایەتی زمانە ئێرانیەکانی سەردەمی کۆن بکا چونکە هەر ئەو دووە بە تەنها خۆیان شوێنەواری نووسراوی سەردەمی سلوکییان هەیە. ئەگەر خوازیاری وردەکاری سیمای مێژوو نەبووینایە هەر بە ئاڤێستا وەک تاکە نوێنەری زمانە ئێرانییەکان وازمان دەهێنا چونکە کۆنترین و

دەوڵەمەندترین دەقە، کە خاوەنی 83000 وشەیە و لەگەڵ فارسی کۆندا، بە خۆی و چوارسەد وشەوە بەراورد ناکرێ.

دەبێ وێنەیەکی نووسراوی زمانی ئێرانمان هەبێ و بیکەینە پێوەر بۆ ئەو ڕۆڵەی دیویەتی چونکە کوردی و زۆر زمانی تری ئێرانی نە نووسینی کۆنیان هەیە نە ناوەنجی و هەمووشیان لە سەر لستی زمانە نوێیەکان دانراوون ئەگەرچی ئەوەش زانراوە کە هەموویان بەر لەوەی گەلانی هند و ئێرانی ببنە دوو بەشەوە، هەبوونە. ئەمە شانبەشانی ئەوانە دەڵێم کە بۆیان نەسەلماوە ئاڤێستا بە زمانی قەومە میدیەکەی زەردەشت بووە و ئەگەر وا دانێین زمانی ئاڤێستا میدی بووە کوردی دەچێتە خانەی زمانە کۆنە ئێرانیەکانەوە. ئەم قسەیە پێچەوانەی ئەوە نییە ئاڤێستا بە پیتێک نەنووسراوە تایبەت بووبێ بە میدیەکان و ئەوەش سەلماندنی ناوێ. ئەو سێ ڕۆڵە لە داهێنانی زانایانی سەردەمن.

بە پێی ئەو پێوانەکارییە پەهلەوی سروشتی ناوەڕاستی دەسەڵاتی ئەشکانیەکان و ساسانیەکان و تا هێرشی ئیسلامی تێدایە و خەسڵەتی نوێی دوای ئیسلامیشی تێدایە تا ئەو سەردەمانەی کە چی دی بەکار نەدەهێندرا و بووە زمانێکی کۆنینە و لە هەندێ ڕێوڕەسمی ئایینی زەردەشتیدا، لە هەرکوێ بوایەن دەگوترا و ئێستاش لە یەزد و کرمان، لە ئێران و هەندێ شوێنی هند کە گرنگترینیان «بۆمبای»ە مەکۆیان هەیە و ئەوانە نەوەی پارسەکانن کە دوای هاتنی ئیسلام کۆچیان کرد و بەسەرهاتیان بە شیعر و بە پەخشان پارێزراوە.

بە پێویستی نازانین لە سەر بەکارهێنانی پەهلەوی لە سەردەمی ساسانیدا فرەوانتر بدوێین لە دەقی مانەوی نەبێ، وازمان لێ هێنا. پێشتر ئاماژە بە زمانی هوزاوارش کرا کە بە بەربەرینی لە پەهلەویدا و تا ئەندازەیەکیش لە فارسی ناوەڕاستدا و لەوەش کەمتر لە «غدیە»دا

بەکار دەهێندرا. غدیە، کە لە ئاڤێستادا بە سوغدە ناوی هاتووە و لەو وشە ئارامیانە پێکهاتووە کە بە هۆی پێداویستی ڕوونکردنەوەوە چوونەتە ناو نووسینی پەهلەوییەوە و نیشانەی شیکردنەوەی پەهلەوی لە کۆتایی وشــە ئارامیەکــان پــارێزراو بــووە وەک ئەوەی نیشــانەی ســەرچاوەی پەهلەوی «تن» بخەنە سەر وشەی «دەنووسن» و بە «دەنووسنتن» تۆماریان دەکرد و خوێنەری ئەو سەردەمە بە «نویشتن» واتە نووسین دەیانخوێندەوە و بەو شێوەیە. بەلام پێویست بە درێژەپێدان ناکا. هەندێ لە هۆیەکان بۆ ئەوە دەگەڕێنەوە کە نووسینی پەهلەوی بە خەتی ئارامی دەنووسرا نەختێ زەحمەت بوو و شێوەی وشە پەهلەوییەکان لە یەکەوە نێزیــک دەبــوون و ئەگەر بە پەهــلەوی بنووســرابا، دەبــوو هاوشــێوە ئارامییەکەی بنووسن و هەموو جارێ نیشانەی چاوگی پەهلەوی بخەنە کۆتاییەکەی و بە پەهلەوی دەسکاریکراو بیخوێننەوە. بەڵام چۆن زانــدرا وشەی ئارامی بە پەهلەوی دەنووسران، بە زۆر بەڵگە ئەوە سەلمێندراوە. لە هەموان بەهێزتر کتێبێکی زمانەوانی بە ناوی «فرهنگ پهلوانیک ـ قاموسی پەهلەوی»ی سەردەمی ناوەنجی ماوەتەوە هەموو ئەو وشە ئارامییانەی تێدان کە لە بری پەهلەوی بەکار هێندراوون. جگە لەوەی بڵێین ئەو شێوازە ئاڵۆزە هەندێ جار دەبووە هۆی گۆڕینی گوتنی وشەی پەهلەوی کە بەر گەمەی «هوزوارش» کەوتبوون، پێویست ناکا زیاتری لە سەر بڕۆین. ناشزانم ئەم شێوازە چۆن بە هوزوارش ناو نرا.

ئەوەندەی پەیوەندی بە ڕێڕەوی کوردییەوە هەبێ، ئەوە هەموو قسەکان بوو لە سەر پەهلەوی. هەردووکیان دوو داون لە یەک تیرێژی زمانە ئێرانییەکان و بە تەنیشت یەکەوەن و جیاوازی چارەنووسیان ئەوەیە پەهلەوی گەشەی کرد و لە کۆتاییدا وەستا. کوردیش وەستا و دوایی گەشەی کرد. ئەگەر بسەلمێندرێ لقێکی کوردی پەیوەندییەکی لە

ئاسایی توندتری بە پەهلەوییەوە هەیە ئەوە بۆ تاموچێژی مێژوویی بوو و باشتریشە ببێتە موژدە بۆ گومانی خەڵکی کە چەندین سەدەیە زەوت کراوە و هەمووشی قسەی ڕێتێچوونە و نەسەلمێندراوە و پێم وا نییە بە یەک ڕێگاش بسەلمێندرێ، ئەوەش ئەوەیە کە قسەی هەورامی وای بۆ هەڵکەوێ خەسڵەتی کۆنی تێدا بژێ ئەوجا جۆرە گومانێکی گشتی دێتە ئاراوە کە لە سەر زاری ئاریەکان بە گشتی سەرنج دراوە و بەشی پەهلەوی بە ناچاری لە بەشی فارسی زیاتر دەبێ چونکە پەهلەوی زمانی ناوەراستە و ئەوەندە دوور نەبووە لیکچوون ڕوو نەدا وەک چۆن هەخامەنشیەکان کە تەنانەت بە فارسی نوێی کیژی خۆشی نەدەچوو. پاشەڕۆژ بە شێوەیەک لە شێوەکان گومانمان بۆ دەکاتە یەقین. بەڵام بەڵگەیەکی مێژووییمان بە دەستەوەیە و هەندێ ڕووناکایی دەخاتە سەر ڕێرەوی شێوەزاری هەورامی و خەسڵەتی پتەویی دەردەخا. ئەو بەڵگەیە کتێبی «نور الانوار»ە کە عەبدولسەمەدی توداری ساڵی 1099ی کۆچی لە سەر ڕەچەڵەکی ساداتی کوردی ناوچەی هەورامان و دەوروبەری نووسیویەتی و لە ناوەڕۆکەکەیدا دوو شت بۆ ئێمە گرنگە کە پەیوەندییان بە بابەتەکەوە هەیە و یەکەمیان شێوەی کڕین و فرۆشتنە لە گوند و گەرەکی ئەو ناوچەیە و دوای بیسمیللا و پێشەکی و سەلاوات. بە عارەبییەکی هاکەزایی دەڵێ: ئەوجا میرزا عەبدولکەریم کوڕی میر خالید کوری ئەحمەد بابانی بە کەیفی خۆی مولکەکانی کە کەوتبوونە «پشت رێ» و «کورەوز» مەبەستم هەمەدان و قشڵەکانیتی و «اسفرنگین» و پارچەی «بن» و «گاوران» و «نینە» و «گولان» و قسلەکانیان «نیزل» و «گلیە» و «بیدرە» و «چوین» بەرانبەر دووسەد و یەک مسقال زێر بە شێخ زدکەریا کوری شێخ عەبدولرحمان... هتد. ئەم کڕین و فرۆشتنە. چێشتانی ڕۆژی

پێنجشەممەی پێنجی ڕەبیعی یەکەم، ساڵی شەشسەد و حەفتاوپێنجی کۆچی پێغەمبەری گەورە دروودی لێ بێ، مۆر کرا.

نووسەری گرێبەندەکە قازی ئەسعەدی خەڵکی «بایگەڵان» بووە و عارەبیەکەی تێکەڵێکە لە فێربوون و ڕاهاتن. زانینی عارەبی و ڕاهاتنی کوردی دەقێکیان بەرهەم هێناوە هەم هێزی تێدایە هەم دوو بلقی هەڵقولانی ڕاهاتن.

تەمەنی ئەو گرێبەندە ئەمڕۆکە حەوتسەد و سیودوو ساڵە و دوو شایەدیی لە سەر دوو ڕاستی تێدان کە بۆ ئێمە زۆر جێی بایەخن. یەکەمیان ناوی گوند و قشڵەکانە، کە ئەو دەمە نۆزدە ساڵ بە سەر کۆتایی دەسەڵاتی عەباسیەکاندا تێپەڕیوە، کوردی بوونە و بە زاراوەی دانیشتوانی ناوچەی هەورامان بوونە و هەمووشیان بە کەڵکی ئەوە دێن ئەمڕۆ ناوی گوندی ئەو ناوچەیە بن. شێوازی ناوەکان هەتا ئەمڕۆ، لە ماوەی حەوت سەدە و چارەکە سەدەیەکدا، بە هیچ شێوەیەک گۆڕانی بە سەردا نەهاتووە و بەڵگەنەویستیشە کە ئەو ناوانە لەو ڕۆژەدا دانەنراون کە گرێبەستەکەی تێدا نووسراوە و دەشێ لە ڕووی پێوانەکارییەوە بڵێین چەند سەدەیەک پێشتر بەو ناوانەوە بوونە و تەنانەت مانەوەیشیان بەو ناوانەوە لە دوای هێرشی مەغۆل کە هەموو شتێکیان ژێروژوور کرد، ئەو بۆچوونە پشتئەستوور دەکا. مانەوەی ئەو ناوانە لە دوای ئەو بشێوێنیانەش کە دوای بوومەلەرزەکەی مەغۆل ناوچەکەی گرتەوە بەڵگەی بەهێزییانە و ئاماژەشە بۆ هاسانی بەردەوامبوونیان بە خۆیان و واتایانەوە، لە ماوەی ئەو چەند سەدەیەدا کە ئاسوودەییان تێدا باڵادەست بووە. تا ئاستی باوەڕپێکردنی گردەبڕ وا پێ دەچێ ئەو ناوانە لە سەردەمێکدا هەبووبن هێشتا پەهلەوی لە ناوچەکەدا باڵادەست بووبێ و هێزی گرێبەندەکەی تری فرۆشتن ئەم

بۆچوونە پشتڕاست دەکا کە لە نێوان دوو کەسدا بووە و پەیوەندی بە مولکایەتی گوندێکەوە بووە ناوی «هەزار کوڕە» بووە و ئەوجا کرپارەکە پێشکەشی شێخ خالیدی کوڕی شاذلی دەکا و ئەم شێخ خالیدە باپیری باپیری ئەو شێخ زەکەریایە بووە کە لە گرێبەندی یەکەمدا ناوی هاتووە و گونـــدەکەش لە نـــاوچەکەدایە. بەڵام گونـــدی «هەزارکـــوڕە» ئەوە دەگەیەنێ هەزار کوڕی تێدا بووە و ئێستاش ئەو شێوازە گوتنە لە زۆر جێی کوردستاندا باوە. جا با لێکی بدەینەوە چەند ساڵ لە نێوان باپیری باپیر و نەوەی نەوەدا دەبێ. بە پێوانەی سەردەمی ئەمڕۆی من مردنی باپیری باپیرم «ئەلواسیق بیللا عەبدوڵای کوڕی عەبدولڕەحمانی جەلی» کە ساڵی 1246ی کۆچی بووە و ماوەکە سەدوشەست ساڵە و ئەگەر بۆ ڕێککەوت دە ساڵی لێ کەم بکەینەوە، سەدوپەنجا ساڵ دەخرێتە سەر 732 و دەبێـتە 882 ســاڵ کە تەمەنـی ئەو وشــەیەیە کە لە ڕێزمــانی کوردیدا تێکەڵ و هاوەڵناوە. مانەوەی وشـەی تێکەڵ ئەو ماوە دوور و درێژە واتای قووڵتری هەیە و بە ڕابردوودا ڕۆچووە. گرێبەندی دووەم کە لە یەکەمیان کۆنترە، بە هۆی زۆریی ناوەکانیەوە دوامخست جگە لەوەی گەڕانەوەمـــان لە دووەمەوە بـــۆ یەکەم بە مەبەســـتی گەڕانەوەی شێوەزاری هەورامییە بەرەو سەردەمی پەهلەوی. بەڵگەی چاوەڕواننەکراو لە گرێبەنـدی دووەمـدا ئەوەیە فرۆشـیاری ئەو گونـد و ناوچـانە میـرزا عەبدولکەریمی کوڕی میر خالیدی کوڕی ئەحمەد بابان بێ و باپیری بابـان بـێ و بە دوو پشـت لە پـێش نەوەی 675ی کـۆچی بێ، بە پێـی لێکدانەوە دەبێ بەر لە ساڵی 600ی کۆچی لە دایـک بووبێ. ئەوەنـدەی من بزانم کەس بۆ ئەوە نەچووە بابانەکان ئەو ڕەگە قووڵەیان هەبووبێ.

دووەم شـــت دوو شـــیعرە خـــاوەنی نووســـینەکە لە شـــێخەکەیەوە دەیانگوازێتەوە، کە لە دوو بۆنەدا بە شێوەزاری «گۆران»ی داینـاون و

تەمەنی شیعرەکان تا ئەمڕۆ 320 ساڵە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی جیاوازی مەودای نێوان نووسینیاندا کە تەمەنی کۆنەکەیان لەو ژمارەیەی سەرەوە زیاتر دەبێ. یەکێ لە شیعرەکان بۆ پێداهەڵدانی باپیری، پێغەمبەری عـــارەبی، لە کـــاتی زیـــارەتی مەرقەدەکەیـــدا داینـــاوە و تـــاکە شیعری «گۆران»یە لە بنەمای وەزنی خۆی لایدابێ و هەندێ ڕەچاوی عەرووزی کـــردووە. زمـــانی ئەو شـــیعرە. زمـــانی ئەو شـــیعرانەیە کە بە «گۆران»ی، لەوساوە تا ئێستا نووسراون. سەیر نییە زمانی ئەدەب لە مەودای چەند سەدەیەکدا خۆی بگونجێنێ، بەڵکو سەیر ئەوەیە زمانی شیعر خـۆی لەگەڵ زمـانی ئاخاوتنـدا بگـونجێنێ. ئەم دیـاردەیە هەمـوو لقێکـی زمـانی کـوردی گرتـوتەوە بە هەمـوو شـێوازەکانیەوە. ڕاسـتە هەڵبەستنی شیعر و داڕشتنی گوتەی ئەدەبی جیاوازییان لەگەڵ ئاخاوتنی ڕاسـتەوخۆدا هەیە کە ڕەنـگە لە پێـوانەی دروسـت لابـدا، بەڵام ئەمە یەکێکیان لە بازنەی ئەوی تریان دەرناکا چونکە هەڵە لە ئاخاوتندا وەک هەڵەکردنە لە شیعر و بابەتی ئەدەبیدا.

ئەوەی تا ئێستا گوترا بۆ زانینی پلەوپایەی زمانی کوردی لە ناو تیرێژی زمانەکانی لقی ئاری و ئێرانـی ڕۆژهەڵاتـی گەلە هنـد و ئەورووپییەکانـدا بەسە و بە ئانقەست باسەکەم کورت کردەوە تا هەم کارەکەم ئاسان بێ هەم کات و پشوو بۆ خوێنەر بهێڵمەوە.

ئەنجامـدانی کارێکی تەواو و پێگەیشـتوو لە سـەر هێلێکـی بەربەریـن کە من هەڵمبژاردووە هی ئەوەیە ساڵێک یا دوو ساڵ بخایەنێ تا لێبێتەوە و وەختی چاپ و بڵاوکردنەوە ببری. بەو کاتەش سوودی ڕاستەوخۆی بە سـەردەچی و جـگە لە بەهـا تیـۆری و ئەکـادیمیەکەی هیچـی ئەوتـۆی نامێنی: پێویستە ئێمە خۆمان لەو شتانە لادەیـن کە سـوودیان نیـیە و بەرانبەر ئەوانە بوەستینەوە کە زەرەریان هەیە چـونکە بە بەربەسـتی

ئاشکرا دەورە دراوین و دەبێ بەرانبەر خۆمان بە ویژدان بین و پێی ناوێ نیەتپاکیی بەرەو گومانمان بەرێ. ئەگەر ئەم نووسینە شتێکی لەو تاریکاییەی بەرچاوی خوێنەرانی ڕەواندبێتەوە تا بتوانن ڕوونتر ئەو شتانە ببینن کە ڕوون نین، بەسە بۆ ئەوەی ببێتە هۆکاری شانازی و دڵخۆشیم، ئەگەرنا دەسخەڕۆیی شوێنەوارێکی قووڵی دەبێ و دەبێتە هۆی خەمێک کە بارودۆخە بەرچاوەکان دەریدەخەن.

سەرنج:

بۆ گێڕانەوەی کورد بۆ میدیەکان سەرنجی کتێبی پرۆفیسۆر ڤلادیمیر مینۆرسکی بدەن بە وەرگێڕان و پەراوێزی دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەدەوە، کە لە ژمارە یەکی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، لە بەشە عارەبیەکەیدا، ساڵی 1973 بڵاو کراوەتەوە.

ئەوەندەی پەیوەندی بە کتێبی «نور الانوار»ی نووسەری فارسییەوە هەیە، بەڕێز محەمەدی مەلا کەریم ئەو لایەنانەی لێ دەرهێناون کە تایبەتین بە ناوچەی هەورامان و مەریوانەوە و ساڵی 1970 لە بەغدا بڵاوی کردەوە ـ چاپخانەی سەلمان ئەعزەمی «هەندێ لە مێژووی هەورامان و مەریوان» چەند لاپەڕەیەک لە کتێبی نور الانواری عەبدولسەمەد توداری لەگەڵ پێشەکی و چەند پەراوێزێکدا.

بەغدا 1986/12/29

مەسعوود محەمەد